# تاوانبار و سزا

سابیر بەکر بۆکانی
ماستەر لە سایکۆلۆژیای کەسێتیو دروستی دەروونیدا

سلێمانی / 2002

**برام ... کامیل**

**ئەی بێ تاوانترین شەهید:**

**ئەم دیارییە بۆ تۆ**

# ناوەڕۆك

# پێشـــــەکــــی

تـاوان وەك گرفتێکی کۆمەڵایـەتی وسیمایەکی دزێـوی ژیـانی ڕۆژانــەی کۆمـەڵ، بــەدرێژایی مێــژوو ئــەوەندەی پێنــەکراوە پرۆســەی پەرەســەندن وپێشکەوتنی مرۆڤایـەتی پـەکبخات وکـاروانی بەمــەدەنی بوونــی کۆمــەڵگا بوەســـتێنێت، ئـــەم دیاردەیـــە لەتـــەواوی کۆمەڵگـــەکاندا بەســـەرەتایی وشارســتانی‌یەوە بــەکۆن وهاوچەرخی‌یــەوە، بوونـــی هــەبووە و لەســەدان وهەزاران ڕەنگ و وێنەی جیاجیادا خۆی نوێ کردۆتــەوە وبـۆ ساتەوەختێك بەرۆکی مرۆڤایەتی بەرنــەداوە. ڕەنگە لێکدانــەوە فەلسەفی‌یەکان وچیرۆکە ئایینی‌یــەکان وتێڕامــانی بیریــاران، هەریەکـــە بــەجیاوازی بـــاگراوندی ئـایدیۆلۆژی خۆیـەوە ئـەوەندەی پێکرابێت سـەرەتایەك بـۆ ئــەم ڕەفتــارەی مــــرۆڤ بخـــەملێنێ وبیبەســـتێتەوە بەســـەردەم وقۆنـــاغێکی مێژوویـــی دیـاریکراوەوە، بـەڵام ئاسـتەم ومەحاڵــە بـەوردی ئـەو سـەردەم وقۆناغـەی ئایندەی ژیانی مرۆڤ دەستنیشان بکرێت کەتیایدا دیاردەی تاوان و ڕەفتاری ناکۆمەڵایـــەتی مــــرۆڤ نــــەمێنێت و، هــــەموو پێـــوەرە یاســـایی و کۆمەڵایەتی‌یـەکانی تـەواوی مرۆڤایـەتی یـەکبگرن وهـاوڕابن لەســەر دیـاری کردنــی چەمکــەکانی خـێرو شــەڕو ئـیرۆس وسـاناتۆس وتــاوان وناتــاوان وڕەفتاری کۆمەڵایــەتی‌و ناکۆمەڵایـەتی. ململانـێی نێـوان ئـەم هاوکێشـەیەی ژیان بێ سەرەتاو کۆتایی‌یەو نابڕێتەوە.

پێم وایە ئەم سەرمەدیەی تاوان کردن وابەستەیە بەئالۆزیو فرە ڕەهەندی وریشەداری خودی دیاردەکەوەو، لەهەموو بوارەکانی ئیکۆلۆژی وکۆمەلآیەتیو سیاسی وکارگێری وئابووریو... تاد، دا خۆی دەبینێتەوە ودەبینرێت و، هەموو فاکتەرە سایکۆلۆژیو تەندروستیو زگماکی وسیاسی وئابوری...تاد، سەرچاوە گەلێکن بۆ خولقاندن وسەرهەڵدانی تاوان وبەردەوامی پێدانیو هێشتنەوەی تاوانباران بە پێودانگە یاساییو ئاکارییەکان.

زۆرێك لەو تاوانانەی ڕۆژانە کراون ودێنە کردن کەس پێیان نازانێتو بکەرو بەرکاری تاوانەکە ئاشکرا نابن، هەندێکیشیان پێدەزانرێنو دەردەکەون تۆمەتبار یان بکەری تاوانەکە نادۆزرێتەوەو ئاشکرا نابێت، بەشێك لەو تاوانبارانەی ئاشکرا دەبن ؛ هەڵدێن وخۆفوتار دەکەن وبەشێکیشیان ئەستۆ پاکی دەسەلمێنن وتاوانەکانیان بەسەردا ساغ نابێتەوە، بەشێکی کەم لە بکەری ڕاستەقینەی تاوانەکان دادگایی دەکرێن ودەخرێنە نێو زیندانەوە، زۆرێك لەوانەی نێو زیندان قوربانی نەخۆشی عەقڵیو، باری دەروونی پەشێوو، فریوخواردووی بەدکاران و، گرفتاری پەروەردەی نادروست وژینگەی پڕلەتاوانکارین یان بەدبەختی داب ونەریتی ڕزیون و، هەشیانە بەرستەمی پۆلیس دادگا ودادوەر کەوتوون. ئەوە ساویلکەییە ئەگەر پێمان وابێت بەگرتن وبەندکردنیان ئیدی کۆمەڵ لە تاوان پاك دەبێتەوە یان ئەوانەی دەری زیندان فریشتەن وبەهیچ جۆرێك گەردی تاوان لە گەردنیان نەنیشتووە وبێ تاوانن. لەلایەکی تریشەوە نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کەتاوانبار هەرچییەکی کردبێت و بکەری هەرتاوانێك بێت، بەتاوانباری لەدایك نەبووە وڕەنگە لەبارو ڕەوشێکی ترو لەپرۆسەی چاککردنەوەدا مرۆڤێکی ئاسایی نا تاوانباری لێدەربچێت.

خوێنەری بەڕێز.....

ئاگایی وتێگەیشتن لە چەمکەکانی تاوانناسی و، تیۆرەکانی لێکدانەوەی کەسێتی تاوانبارو، زانستی سزادان وقۆناغە جیاجیاکانی پەرەسەندنی سزاو زیندان وچاککردنی تاوانباران، وەك هەر کایەیەکی تری مەعریفە، بەپێویستییەکی حەتمی دادەنرێت بۆ بەرقەرارکردنی کۆمەڵی مەدەنی و، بۆ فراوانکردنی ئاسۆی هۆشیاریو ڕووناکبیریمان و، زیاتر لەوەش بۆ حوکمدانی عەقڵانی وزانستی ولۆژیکی بەسەر تاوان وتاوانباراندا، بۆ مامەڵەکردنێکی شارستانی لەگەڵ ئەو چەمکانەدا کەدەکەونە نێو بابەتەکانی زانستی تاوان وسزاوە، هاوکاتیش بۆ ئەوەی لەگەڵ فەلسەفەی سزاو ڕەوتە پێشکەوتووەکانی بواری چاککردنی تاوانباراندا ڕێ بکەین ویەکبگرینەوە لەگەڵیاندا ولەخۆڕا نەکەوینە ستایش یان سەرزەنشتی دەزگا پەیوەنددارەکانی تایبەت بەتاوان وتاوانبارەوە.

**سابیر بەکر بۆکانی**

**2002/8/5**

**سلێمانی**

## سەرەتایەکی گشتی

ئەگەر بەدوای سەرهەڵدانی زانستیانەی تاواناسیدا بگەڕێن و بمانەوێت خاڵی دەستپێکی ئەم زانستە دیاری بکەین، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، لەودەمە بەدواوە تیورو دیدو بۆ چوون و بوارەکانی پراکتیزەی ئەم زانستە بەپەرە سەندنێکی بەردەوامدا ڕۆشتوون و هەتا ئەمڕۆ لە سوڕی پێکهاتن و گەشەدان، لەم پێناوەدا دەکرێت بڵێین تاواناسی خۆی لەخۆیدا بریتییە لەمێژووی تیۆرەکانی تاوانکاری.

زانستی تاوان هاوشێوەی ئەو زانستانەی کە مرۆڤیان کردووە بەسەنتەری تویژینەوەکانیان، مێژوویەکی نوێی هەیەو، لەوکاتانەوە پەرەی سەندووە کەشێوازو میتۆدە زانستییەکان بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتەکانی ژیاندا، هاتوونەتە بوون وگەشەیان کردووە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو مێژووە بدەین کەهەندێ لایەنی ئەم زانستە ڕۆشن دەکەنەوە. بۆ نموونە لە گوفتاری فەیلەسوفەکانی وەك سوکرات و ئەفلاتون وئەرستۆدا، هەندێك هێماو ئاماژە بەدی دەکرێن کەتاوانکاری دەگەڕێننەوە بۆ سایکۆلۆژیای مرۆڤی لادەر و دەیبەستنەوە بەناتەواوی ڕەوشت و جەستەوە، بەواتا کەمئەندامی جەستەیی و بەدڕەوشتی سەرچاوەی ئەو تاوانانەن کە دێنەکردن (1).

ساڵی 1586 دیلابۆرتا لە کتێبی ((زانستی تاوان))دا دەڵێت: تاوان پەیوەندی بە ڕوخسارو نێوچاوان و چاوی مرۆڤەوە هەیە.

ئەو تیۆرو ڕێبازە زانستییانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە لە تاواناسیدا پەیدابوون، هەوڵ و تویژینەوەی وردی زانستی بوون بۆ

گەڕان بە دوای هۆکارەکانی تاوانکاری و پێکهاتەی ئەو ڕەفتارانەدا کەلە سنورەکانی تاواندا دەسوڕێنەوە. ئەو دیدو بۆچوونە جیاوازانە هەر یەکەیان هزرو ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتیان لە پشتەوەیە و بنەما تیۆرییەکەی خۆیان لەسەر داڕشتووە. هەندێکیان لە لێکدانەوەی ڕەفتاری تاوانکاریدا فاکتەرە زگماکی و بۆماوەیی‌یە فسیۆلۆجی‌یەکان بەبناغە دادەنێن وەك قوتابخانەی ئەنترۆپۆلۆژیای ئیتاڵی، گەرچی چەند بیریارێکی سەربەو قوتابخانەیە باس لە هاوبەشیکردنی فاکتەرە کۆمەڵایەتی‌یەکانیش دەکەن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕەفتاری تاوانکاری دەگەڕێننەوە بۆ فاکتەرە بۆماوەیی‌یەکان (2).

بەشێکی‌تر لەو تیورانە قوتابخانەی بایۆلۆژییان پێکهێناوەو تەنها فاکتەرە بایۆلۆژی‌یەکان بە هەند وەردەگرن. ئەم قوتابخانەیەش لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بە هۆی پێشکەوتنی توێژینەوەکان لە زانستی گلاندەکان و کاریگەری گلاندەکان لەسەر هەڵچوونەکانی کەسێتی‌و، کاریگەری کیمیای جەستەی مرۆڤ لەسەر هاوسەنگی هێزە دەماری و دەروونی و فسیۆلۆژی‌یەکان، تەشەنەیان سەندو بڵاوبوونەوە. بەشێوەیەکی گشتی ڕەفتاری تاوانکارییان دەگەڕاندەوە بۆ پەشێوی لە گلاندەکانی جەستەدا.

هەندێك تیۆری تر بە ئاقاری فاکتەرە عەقڵی‌یەکاندا دەڕۆشتن و هۆیەکانی تاوانکارییان دەبەستەوە بە لاوازی هێزە عەقڵی‌یەکانی مرۆڤەوە کە بەرئەنجامی نەخۆشی یان ناتەواوی یان پەشێوین لە کۆئەندامی عەقڵی و دەماری مرۆڤدا.

چەند تیۆرێکی تریش قوتابخانەی سایکۆلۆژییان پێکهێناوە و، بۆ لێکدانەوەی ڕەفتاری تاوانکاریش ئاماژە بە پەشێوییەکانی نێو کۆئەندامی دەروونی مرۆڤ دەکەن کە ئەوانیش بەرئەنجامی تێکچوون و لادان بوون لە غەریزە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤدا.

پێویستە بگوترێت پێشکەوتنی توێژینەوەکانی زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکان و بەتایبەتیش لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵناسی‌دا وەك زانستێکی سەربەخۆ لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئیدی بیرکردنەوەی زاناکان ڕوویان کردە کێشە کۆمەڵایەتی‌یەکان کە تاوان یەکێك بوو لە و کێشانە، توێژەران بەگشتی و زانای هەڵکەوتووی ئامار(کۆتلیت) سەلماندیان کە ڕەفتاری تاوانکاری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی‌یە و هۆکارەکانیشی لە هەناوی ئەو کۆمەڵگایەوە سەرچاوە دەگرن کە تاوانەکە تیایدا دێتە کردن (3).

تاواناسی بۆ یەکەمجار لە ئەمریکادا دەرکەوت و وەك خوێندنی زانکۆیش لە بەشەکانی کۆمەڵناسی‌دا دەخوێندرا و هەتا ئەمڕۆش هەرتایبەتە بەو بەشەوە. بەڵام لە وڵاتەکانی ئەوروپادا توێژینەوەکانی تاواناسی لەو پەیمانگایانەدا دەخوێندرێن کە سەر بە کۆلێجەکانی یاساو مافن (4).

ئەمڕۆ تاواناسی شوێنێکی مەزن و پڕ بایەخی لە مەیدانی توێژینەوە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا داگیر کردووە و، بریتی‌یە لەو زانستەی لە دیاردەکانی تاوانکاری دەکۆڵێتەوەو لە هەوڵی دۆزینەوەو ناسینی فاکتەرەکانی تاوان کردندایە تاکو زۆرترین هۆکار کۆنترۆڵ بکرێت و هەموو ڕێگاو کەرەسەیەك بگیرێتە بەر بۆ بەرەنگار بوونەوەی و ڕزگار کردنی دامەزراوە کۆمەڵایەتی‌یەکان لە زیان و شەڕانگێزی‌یەکانی ڕەفتاری تاوانکاری و، سەبارەت بە تاکەکەسانیش دورخستنەوەی کارەسات و نەهامەتی دەگرێتەوە (5).

## تاواناسی وەك چەمك و بابەت

له پێناسه كردنی تاواناسیدا دكرێت بڵێین: بریتی‌یه له‌و زانسته‌ی له تاوان و سزا و ڕێگا چارەسازییەكانی‌تر دەكۆڵێتەوەو بەم پێیە ئامانجی ئەم لقەی زانست پەیوەستە بەیەكێك لەلایەنەكانی ڕەفتاری تاكەكەس لە كۆمەڵدا، ڕەفتارێك كۆك و تەبا بێت لەگەڵ بنەما یاسایی و ئاكاری‌یەكاندا (6).

ئەو بوارانەش كە توێژینەوەكانی تاواناسی دەیانگرێتەوە تەنها بریتی نییە لە وەسف كردنی ڕەفتاری مرۆڤایەتی وەك خۆگونجاندن یان نەگونجان لەگەڵ بنەما یاسایی و ئاكاری‌یەكاندا، بەلكو بوارەكانی لێكۆڵینەوەكانی تاواناسی قوڵتر و هەمەلایەنترو خۆی لە شیكردنەوەی سەرجەم فاكتەرەكانی پێكهێنەری تاواندا دەبینێتەوە، ئینجا ئەو لایەنە كەسێتی بێت واتا بكەری تاوانەكە بێت یاخود لایەنی ماددی پەیوەست بە خودی تاوانەكەوە بێت، ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە كە تاوان دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی‌یە و زیان بە كۆمەڵ و تاكەكانی دەگەیەنێت. ئەمە لەلایەك، لەلایەكی‌ترەوە توێژینەوەكانی ئەم زانستە ڕەفتاری تاوانكاری و، فاكتەرەكانی خولقاندنی دەگرێتەوە، ئینجا ئەو فاكتەرانە كۆمەڵایەتی بن یاخود تاكەكەسی بن كە دەبنە هۆی ئاڕاستەكردنی ڕەفتاری تاوانكاری (7).

فاكتەرە كۆمەڵایەتی‌یەكان لە فراوانترین مانایاندا ئابوری و سیاسی و كەلتوری و بارو زروفی ژینگەیین، ئەم لایەنانەش تایبەتن بە تاواناسی تیۆری‌یەوە Theoritical Griminology. بەڵام فاكتەرە كەسی‌یەكان تایبەتن بە خودی تاكەكەسەكەوە وەك لایەنە عەقڵی و سایكۆلۆژی و بایۆلۆژی و

فسیۆلۆژیەکان، گەرچی ئەم لایەنانە بۆ خۆیان بابەیەتی تویژینەوەی زانستەکانی ترن بەلآم تاواناسی قەوارەی خۆی لە بۆتەی ئەو لایەنانەدا دەبینێتەوە ئینجا ئەو لایەنانە لە کاتی بەکارهێنانیان بەیەکەوە یان بەجیا لە مەیدانی پراکتیکیدا، تاواناسی پراکتیکی Aplied Griminlogy پێك دەهێنن (8).

مادام تاوان یەکێکە لە دیاردە کۆمەلآیەتیەکان، بۆیە لە ڕاڤە کردن و شیکار و لێکدانەوەیدا(بەشێوەیەکی زانستی) دەبێت بگەڕێینەوە بۆ لێکۆڵینەوەی سەرجەم فاکتەرە کۆمەلآیەتی و تاکەکەسیەکان، چونکە تاوان لە سروشت و وێنە هەمەجۆرەکانیدا جگە لە کارلێك کردن و ئاوێتە بوونی تاکەکەس لەگەڵ ڕێکخراوە کۆمەلآیەتیەکایدا، هیچیتر نییەو، تەنها ئەو دوو پۆلە فاکتەرە ڕەفتاری مرۆڤ ئاراستە دەکەن و دەینەخشێنن، ئینجا ئەگەر ڕەفتاری مرۆڤەکە دژو ناکۆك بێت لەگەڵ سیستمی کۆمەلگاو بنەماياساییەکانیدا ئەوا پێیدەوترێت ((ڕەفتاری تاوانکاری)) بەلآم ئەگەر کۆك و تەبابێت لەگەڵیاندا و دژیان نەوەستێت، پێی دەوترێت ((ڕەفتاری کۆمەلآیەتی)) (9).

تاواناسی بەو پێیەی ڕەفتاری تاوانکاری بە دیاردەیەکی ترسناك هەژمار دەکات کە هەڕەشە لە کۆمەلگاو تاکەکانی ناوی دەکات، بۆیە ئەو مافەش بە کۆمەڵ دەدات لە پێناو زامن کردنی ئاسایش و ئارامی و پاراستنی قەوارەکەیدا، داکۆکی لە خۆی بکات و بەرەنگاری ببێتەوە. ئەم داکۆکی کردنەش چەند شێوەیەك بەخۆوە دەگرێت و هەندێجار بەکەرەستەی گشتی دەیکات بۆئەوەی سیستمی کۆمەلآیەتی چاك بکاتەوە، وەك کەرەسەکانی نەهێشتنی بێکاری و، بلآوکردنەوەی خوێندەواریو، دابین

کردنی ژیان لەڕێی چاکسازی ئابوریەوە یان لەڕێی پاراستنی مافی تاکە کەسانەوە ئەویش بەچاککردنی سیستمی سیاسیو....تاد.

لە هەندێ حاڵەتی تردا بەکەرەستەی تایبەتی دەیکات کە ئاراستە دەکرێن بۆ ڕەفتاری خودی تاوانبارەکە، ئەویش بەگرتنە بەری کەرەسەی تەکنیکی وەها کەبتوانێت توێژینەوە بۆ تاوانبارەکە بکات و هۆیەکانی لادان و تاوانەکەی بدۆزێتەوە و پاشان هەوڵ بدات ئەو هۆیانە بنە بڕبکات و کەسەکە بهێنێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست و دوری بخاتەوە لەجیهانی تاوان (10).

لێرەدا بەمەبەستی ڕونکردنەوەی زیاتر چەند پێناسەیەکی تاوانناسی دەخەینە ڕوو، ناکرێت وابەستە بین بەپێناسەیەکی دیاری کراوەوە چونکە هەتا ئەمرۆ پسپۆڕو شارازایانی بوارەکە لەسەر پێناسەیەکیووردو هەمە لایەنەی ئەم زانستە ڕێکنەکەوتوون، تاوانناسی بریتی لە:-

- لەزانستی هۆیەکانی تاوان کردن.
- لەو زانستەی گرنگی بەلێکۆڵینەوەی تاوان دەدات لەڕێی توێژینەوە لە تاوانبار لەلایەنەکانی: سایکۆلۆژیو، ژینگەی کاریگەرو، ئامادەباشییە بۆماوەییەکان و ئەو حاڵەتانەی پاڵنەرن بۆ کردنی تاوانەکەی.
- پسپۆڕە ئەڵمانیەکان دەڵێن ئەو زانستەیە لەدیاردە سروشتیو حەقیقیەکان دەکۆڵێتەوە کەدەبنە هۆی گەلاڵەکردنی تاوان، هەروەها لەو کەرەسانەش دەکۆڵێتەوە کە قەلاچۆی دەکەن و بەسەریدا زاڵ دەبن.
- پسپۆڕە ئیتاڵیەکان بەم جۆرە پێناسەی دەکەن: لقێکی زانستەو گرنگی بەتاوان دەدات لەسەر ئەو بناغەیەی کەگوایە تاوان ڕاستیەکی واقیعیە نەك ڕاستیەکی یاسایی بێت، بۆیە دەبێت بەدوای هۆکارەکانیدا

بگەڕێین و تاپێمان دەكرێت هەوڵبدەین بۆ بنەبڕكردنی ئەو هۆكارانەی كەتاوان دروست دەكەن (11).

• نیسیگۆڕۆ دەڵێت: ئەو زانستەیە كەسەرجەم لێكۆڵینەوەكانی پەیوەست بەتاوان و تاوانبار وژینگە وهۆیەكانی تاوانكردن و خۆپاراستن و سەركوت كردنی تاوان لەخۆدەگرێت.

• كۆنگرەی نێو دەوڵەتی دووەمی تاوان لەساڵی 1950 كەلە شاری پاریس بەستراوە بەم شێوەیە پێناسەی دەكات: بریتییە لە توێژینەوەی زانستی بۆ دیاردەی تاوان و بابەتەكەشی بریتییە لەلێكۆڵینەوە لە هۆیەكانی دیاردەی تاوان و ڕێگاكانی چارەسەر كردنی (12).

• زانستی تاوان بەچەمكی نوێش بریتییە: لەو زانستەی لەڕەفتاری شەڕانگێزی دژ بەكۆمەڵگا دەكۆڵێتەوە، بەڕووبەڕووبونەوەی ئەو ڕەفتارە لەڕێی گەڕاندنەوەیەوە بۆ فاكتەرە حەقیقیەكانی (13).

بەمەبەستی ڕوونكردنەوە دەكرێت لەم چەند خاڵەدا ئاماژە بۆ بابەتەكانی تاواناسی بكەین:-

- ئەو تاوانانەی دێنە كردن.
- ئەوكەسانەی پێی هەڵدەستن.
- وەسفی یاسایی تاوانە هەمەجۆرەكان (14)، (15).

ئەمانە سەرجەم ئەو بابەتانەبوون كە جێی بایەخی تاواناسین، ئینجا مادام تاوان بەڵگەیە بۆ ڕەفتاری تاوانكاری كەواتە پێویستە بزانین تاوان چییە؟

## تاوان چیيه؟

دەكرێت بڵێین چەمكی تاوان بەسێ قۆناغی گرنگدا تێپەڕیوە كە بریتین لە:

- **قۆناغی ئایینی:** تاوان بەچەمكی ئایینی دەستدرێژی كردنێكی ڕاستەوخۆو ڕاشكاوانەیە بۆ سەر خواوەندەكان و، دەرچونێكی ترسناكە لەوبیرو باوەڕانەی لە ئاسمانەوە هاتونەتە خوارەوە. ئینجا لەبەر ئەوەی خواوەندەكان تاكە پاسەوانن بۆ خێروچاكەی گروپ و بەرژەوەندیيەكانیان، بۆیە هەموو لادانێك لەو بنەمایانەی كە هێزە ئاسمانیەكان نەخشاندوویانن، بە مەترسیيەكی مەبەستدار بۆ خێرو بەرژەوەندی گروپ هەژمار دەكرێت.

- **قۆناغی یاسایی:** كاتێك دەوڵەت وەك دامەزراوێكی كۆمەڵایەتی، كاروباری چاودێریكردنی بەرژەوەندی كۆمەڵی لەئەستۆ گرت، ئیتر تاوان ئەو بنەمایەی وەرگرت كە مەترسیيەكەو هەڕەشە لەبەرژەوەندی دەوڵەت دەكات وسەرپێچی كردنە لەویاساو سیستمانەی كە دایڕشتبوون. لێرەوە چەمكی ئایینی گواسترایەوە بۆچەمكی یاسایی لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا چەمكە ئایینیەكە لە مێشكی خەڵكیدا بەهەڵپەسێراوی مایەوەو، چەمكە یاساییيەكەش سیمایەكی ئایینی پێوە دیاربوو، خەڵكی بەهەمان تێڕوانینی خواوەندەكانەوە تەماشای فەرمانڕەواكانیان دەكرد.

- **قۆناغی كۆمەڵایەتی:** چەمكی تاوان هەتا سەدەی بیستەم لەنێوان هەردوو قۆناغەكەی پێشووتردا لە هاتوچون و هەڵبەزو دابەزدابوو تائەو كاتەی زانستە كۆمەڵایەتیيەكان چەمكێكی نوێیان هێنایە ئاراوە وەك زانستەكانی كۆمەڵناسی و سایكۆلۆژیاو مرۆڤناسی، ئەو تێڕوانینە

نوێیەیکۆمەڵناسی هێنایە کایەوە -سەبارەت بەچەمکی تاوان- بەشۆڕشێکی عەقڵی مەزن هەژمار دەکرێت و سەرکەوتنێکی کەم هاوتا بوو لەمێژووی تاواناسیدا چونکە بەدیدێکی زانستی‌یەوە بۆ تاوانباری دەڕوانی وئامانجی چاککردنی تاوانبارو کارکردن بوو بۆ گۆڕینی ڕەوشەکەی (16).

## تاوان و ئاکار:

تاوان لەڕووی یاسایی‌یەوە بریتی‌یە لەسەرجەم ئەو کردەوانەی لەگەڵ بڕیارو حوکمەکانی یاسای سزاکاندا یەکناگرنەوە. یاسای سزاکانیش ئەو یاسایانەیە کەکردەوە نادرووست و نارەواکان و بڕی سزاکانیان لە خۆدەگرێت ودەستنیشانی دەکات. مادام تاوان لەسروشت و پێکهاتەیدا ڕەفتارێکی دژ بەکۆمەڵگایە، بۆیە دەزگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتی‌یەکانیش یاسایان دارشتوە بۆ سزادانی ئەو کەسانەی پێی هەڵدەستن.ئەم پێناسەیە بەتەواوەتی گشتی و کۆگرنیە، چونکە تاوان هەموو ئەو ڕەفتارانە دەگرێتەوە کەدژ بەبنەماکانی ئاکارن، واتا تاوان کارێکی نائاکاری‌یە وخەڵکی دوور دەکەونەوە لێی (17).

هەموو کردەوەیەکی تاوانکاری خۆی لە خۆیدا دژ بەبنەماکانی ئاکارە بەڵام مەرج نییە هەموو کردەوەیەکی دژ بەبنەماکانی ئاکار بەتاوان هەژماربکرێت. تاوان لەیاسای سزاکاندا دەستنیشانکراوە وهەرکاتێك کردەوەیەکی لەو جۆرە یەکێك لەدەقەکانی یاسای سزاکانی بەسەردا بچەسپێ ئەوا بەتاوان دادەنرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هەندێك کاری نائاکاری کە خەڵکی لێی دوور دەکەونەوە بەتاوان دانانرێت هەرلەبەرئەوەی

یاسا بەندێکی بۆ دانەڕشتووە. کەواتە دەکرێت بڵێین بازنەو ڕەهەندەکانی ئاکار فراوانترە لەبازنەو ڕەهەندەکانی یاسا چونکە:

- کاری نائاکاری لەتێڕوانینی کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت.
- کاری نائاکاری بەپێوەرەکانی کۆمەڵگایەك جیایە لەگەڵ کۆمەڵگایەکی تردا.
- کاری نائاکاری لەلای ئەوانەش کەبەنائاکاری دادەنێن پلەی جیاوازی هەیە وهەموویان وەکویەك تەماشای ناکەن.
- کاری نائاکاری لەزەمانێکەوە بۆ زەمانێکیتر گۆڕانکاری بەسەردا دێت (18).

بۆیە ناکرێت بەدەر لەڕەهەندەکانیکات و شوێن کاری نائاکاری وتاوان دەستنیشان بکەین و پێویستە بەپێی پێوەرەکانی کۆمەڵگاو بنەما کۆمەڵایەتییەکان وەسف بکرێن.

## ئەو زیانانەی بۆ تاوان دەگەڕێتەوە:

تاوان نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتییەو ڕەگ و ڕیشەی لەتەواوی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا داکوتاوە. ئەوتاوانانەی ڕۆژانە دێنەکردن زەحمەتە ئاماری دروستیان بۆبکرێت و، ڕۆژانە هەزاران تاوانبار سزایان بەسەردا دەسەپێنرێت. گومانی تێدا نیە شوێن پێهەلگرتنیتاوانباران و دادگاییکردن و سزادانیان، ساڵانە داهاتێکی زۆریان بۆخەرج دەکرێ. بۆئەم مەبەستە هەندێك زانای تاوان لەچەند دەوڵەتێکی دنیادا هەوڵیان داوە، ئاماری ئەو تێچونانە بکەن کە ساڵانە تەرخان دەکرێت، بۆنموونە لە ئەمەریکا زانایەکی وەك (سمس) لەساڵی 1928-1929 تێکڕای ئەو بڕەپارەیەی کەبۆ قەلاچۆکردنی تاوان سەرف کراوە، دیاری کردووە و بەم شێوەیە

خستویەتی‌یە ڕوو: چوار ملیار دۆلار سالأنە بۆ زیانە ڕاستەوخۆکانی تاوان و، پێنج تا شەش ملیار دۆلار بۆزیانە ناڕاستەوخۆکانی وەك خەرجی پۆلیس و زیندان و دادگاکان، کەواتە کۆی گشتی تێچونەکان لەوساڵەدا نزیکەی (10)ملیار دۆلاربووە لە ولأتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.ئەمە وجگە لەوزیانە مەعنەویانەی کەهەڕەشەیان لەژیانی ئاسایی هاولأتی‌یان کردووە وەك ترس و دڵەڕاوکێو نەبوونی ئاسایش (19).

## خەسڵەتەکانی تاوان:

ئەو دەقانەی لەنێو چوار چێوەی بەندە یاسایی‌یەکاندان بەتەنها پێناسەی تاوانەکانی وەك دزیو کوشتن...تاد دەکەن، بەلأم پسپۆڕو شارەزایانی یاسا چەندین بنەمای گشتی‌یان کورت و پوخت کردۆتەوە کەبەسەر هەموو جۆرە تاوانێکدا دەچەسپێن، ئەو بنەماو پرانسیپانەش لەگەڵ خەسڵەتەکانی یاساکانی تاواندا تەباو گونجاون وبەشێوەیەکی وورد نیشانە گشتی‌یەکانی بابەتی دەقە یاسایی‌یەکە دەستنیشان دەکەن. لێرەدا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

هیچ ڕەفتارێکی دیاری کراو بەتاوان هەژمار ناکرێت ئەگەر ئەم ڕەگەزانەی لەخۆ نەگرتبێت:-

1- بەرلەوەی هەر ڕەفتارێك بەتاوان دابنرێت پێویستە ڕوخسارێکی دەرەکی زیانبەخشی هەبێت، واتا تاوان زیان بەبەرژەوەندی کۆمەلأیەتی دەگەیەنێت. بەتەنها حاڵەتێکی فیکری یان هەڵچوونی کەوا لە کەسێك بکەن بیر لەتاوان بکاتەوە بەس نیەو بەتاوان هەژمار ناکرێت ئەگەر هاتوو لەپێش کردنی تاوانەکەیدا بیرکردنەوەکەی بگۆڕێت وڕاستی بکاتەوەو،

کەسەکەش بە تاوانبار دانانرێت ئەگەر مەبەست ومەرامی تاوانکاری لەپشت کردەوەکەیەوە نەبێت.

2- پێویستە ئەو زیانەی لە ڕەفتارێك دەکەوێتەوە لەڕووی یاساییەوە تابۆ (التحریم) کرابێت ولەیاسای سزاکاندا پێناسەو سنوربەندی بۆکرابێت. ڕەفتاری دژ بەکۆمەڵ بەتاوان هەژمار ناکرێت ئەگەر یاسا تابۆی نەکردبێت ودەبێت یاسایەك بەشێوەیەکی تایبەتی ئەوزیانە دەستنیشان بکات.

3-دەبێت ڕەفتارێك هەبێت -نێگەتیف یان پۆزەتیف، مەبەستدار یان بێمەبەست- کەببێتە هۆی ڕودانی زیان. خۆئەگەر کەسێك لەڕوی مادیەوە ڕقی لەوە بێت تفەنگ بتەقێنێت یان فشار بخاتە سەر پەلەپیتکەی تفەنگ، ئەوا بەبکەری تاوانی کوشتن دانانرێت تەنانەت ئەگەر لەئەنجامی دەرچوونی گوللەی تفەنگەکەشەوە کەسێك کوژرابێت.

- پێویستە پەیوەندی وتێهەڵکێش بوون لەنێوان ڕەفتارەکەو، مەبەستی تاوانکردندا بوونی هەبێت بۆ نموونە: پۆلیسێك بەمەبەستی گرتنی تۆمەتبارێك دەچێتە ماڵێکەوە وتاوانێکی لەدەست دەقەومێت - لەکاتێکدا لەناو ماڵەکەدایە وفرمانی گرتنی تۆمەتبارەکەی پێیە- لەم حاڵەتەدا بەتاوانبار دانانرێت چونکە بەمەبەستی تاوانکردن نەچۆتە ناو ماڵەکەوە. تاوانەکەو ئەومەبەستەی پۆلیسەکە هەیبووە هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکتریەوە نەبووە.

- پێویستە یاسا سزاکەی دیاری کردبێت و، تەنها ئەوەندە بەس نیە کەیاسا زیانەکە دیاری بکات، بەڵکو لەوەش زیاتر دەبێت دەقێکی یاسایی لەئارادا بێت کەهەڕەشەی سزادانی لە خۆگرتبێت بۆ هەموو ئەوکەسانەی بەئیرادەی تەواوی خۆیانەوە سەرپێچی دەکەن لەودەقە یاساییە.

6-پێویستە مەبەستی تاوانکردن لەئارادا بێت. لەم بارەیەوە (هۆل) دەڵێت هەندێك لەپیاوانی یاسا (مەبەست و هاندەر) تێکەڵ بەیەکتری دەکەن، مەبەست کارێکی ئیرادیە و دەبێتە هۆی گەیاندنمان بە ئەنجامێك، بەلاّم هاندەر: هۆکارو پاڵنەرە بۆ گەیشتنە ئەنجام. مەبەستی تاوانکاری بەوەی یەکەمیان بەرجەستە دەبێت نەك دووەم. بۆ نموونە ئەوکەسانەی لەکاتی ڕەفتارێکی نادروست و تابۆدا لەڕووی یاساییەوە، بەشێت هەژمار بکرێن ئەوا ناچنە خانەی تاوانبارانەوە چونکە مەبەستی تاوانکردنیان نەبووە (20).

# تیورەکانی شیکردنەوەی ڕەفتاری تاوانکاری

## تیوری لومبرۆزۆ

لومـبرۆزۆ بـەناوبانگترین زانـای ئەنسـرۆپۆلۆژیای تاوانـە ودامەزرێنــەری قوتابخانــەی ئیتالیــە لەلێکدانــەوەی ڕەفتــاری تاوانکــاریدا ســیمایەکی زانستیانەیان بەتاوانناسی بەخشی.

لومــبرۆزۆ ســاڵی 1836لەشــاری بافیــای ئیتالیــا لــەدایك بــووە ودوای تـەواوکردنی خوێندنـی پزیشکی لـە زانکۆ، بـووە بـە پزیشکی سـەربازی لـە سوپادا و دواتریش بەمامۆستای پزیشکی شـەرعی لـەزانکۆی تۆرینـۆ وئینجا مامۆستا لە نەخۆشیە عەقڵیەکاندا لەشاری تۆرین. کاتێك لەسوپادا پزیشك بـووە زۆربـەی کاتـە بێئیشـیەکانی خـۆی لـە توێکردنـی (تشریح) تــەرمی سەربارەکاندا بەسەر دەبرد. لە ئـەنجامی توێژینەوەکانیـەوە بـۆی دەرکـەوت کەسەربازە ڕەفتارچاك و ڕاستگۆکان، جەستەیان جیـاواز بـووە لـە جەسـتەی ســەربازە خــراپ و شــەڕانگێزەکان. جیاوازیەکـەش لــەو خــاڵ و نیشــانەو وێنانەدا بوون کەلەسەر پێستی خۆیان کوتابویانن بەتایبەتیش ئەو نــەخش و وێنانەی دژ بەبنەماکانی ئـاداب و ڕەوشـت بـوون، بـەڵام سـەربازە ڕەوشـت بـەرزو ڕاسـتگۆکان بـەهیچ جۆرێـك ئـەو وێنانـە بـە جەسـتەیانەوە بوونیــان نــەبووە. ئــەم تێبینــی و ســەرنجانە ســەرەتایەك بــوون بــۆ توێژینــەوەی تاوانبــاران لەلایــەنی ئەنســروپۆلۆژیەوە وەك ڕێبــازو قوتابخانەیــەکی سەربەخۆ (21).

لێرەوە لومبرۆزۆ لەنەخۆشخانەی عەقڵی (شێتخانە) دا دەستی کرد بە توێکاری تەرمی نەخۆشەکان بەتایبەتیش توێژینەوە لەسەر ئێسك وکەللەسەرو کێشی دەماغیان، بە میتۆدێکی بابەتیو ئەزمونگەری. دواجار لە بەندیخانەکاندا دەستی دایە توێژینەوە لەسەر زیندانیەکان وتوێکردنی تەرمی تاوانباران. لەدوای ئەم توێژینەوە وردوزانستیانە، لومبرۆزۆ تیورەکەی دارِشت و دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی ووتارو کتێبەکانی لەو بوارەداو، کتێبە بەناوبانگەکەی لەدوای دوانزە ساڵ لە توێژینەوەی زانستی لەساڵی 1876دا لەژێر ناوی مرۆڤی تاوانبار The Criminal Man بەچاپ گەیاند. چاپی دووەمی ئەم کتێبە کەهەندێك ووتاری بۆ زیاد کردبوو ناوبانگێکی زیاتری بەکتێبەکەیدا (22).

## پوختەی تیورەکەی لۆمبرۆزۆ

دوای ئەوەی لۆمبرۆزۆ پشکنینی پزیشکی بۆ ژمارەیەك تاوانباری نێو بەندیخانەکان ئەنجامدا کەژمارەیان نزیکەی (5907) تاوانبار بوو، وچەندین پێوانەی جەستەیی (بەتایبەتی بۆ کەللەسەر) بۆکردن لەئاکامدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە تاوانبار لە خەسڵەتە جەستەییەکانیدا جیاوازی هەیە لەگەڵ کەسانی ئاسایی ناتاوانباردا، وەك خەسڵەتەکانی بچوکی کەللەسەر (لەلای دزەکان) هەروەها کەللەسەریان گەلێك بەرزیو نزمیو هەڵتۆقین وچرچ ولۆچی تێدایە کەحیای دەکەنەوە لەکەللە سەری مرۆڤی ئاسایی. هەروەها لەنێوان کەللەسەری تاوانباران و هەندێك ئاژەڵدا چەندین لێکچونی فسیولۆژی هەیە وەك: فراوانی دەم و پانی گوێچکەو بەرینی چاڵی فرمێسکی هەردووچاوو ڕوانینی تیژو کونکەرو، لاربوونەوەی نێو چاوان بۆ

پشتەوەی سەر بەشێوەیەك بەشی خـوارەوەی سـەر لەگـەڵ بەشـەكانی تریـدا نارێك و نەگونجاوبێت، هـەروەها بەرزبوونـەوەی ئێسكی ڕوومـەت و، لووتـی كشاو وكـەمێك لاربۆخـوارەوە لەشـێوەی كـەواندا واتـا لوتـی خـوار بەلایـەكدا (ڕاست یان چەپ) و فراوانی كونی لوت و، ددانەكانی پێشەوە نـاڕێزو نـاڕێك و، دەستی درێژو لەپی دەست و پێ كوور (23).

ئەوكەسانەی تاوانی كوشتن ئەنجام ئەدەن دەسـتیان ئەسـتورو گەورەیـە بـــەلاَم دزو گیرفانــبڕ دەســـتیان بـــاریك و لاوازە و پەنجـــەكانیان درێـــژە. لەڕوخساری تاوانباری نێرینەدا (پیاو) مووبە كەمی بەدی دەكرێـت و لـەلای ژنـانی تاوانبــاریش مــوو لەبەشــەكانی دەموچاویــاندا بــەزۆری دەبیــنرێت. هەروەها هێڵەكانی لەولـەپی دەسـتیان تـاك تـاكن و بەیەكـەوە نەنوسـاون و، لەسەر ڕووی پێستیان خاڵیكوتراو هەیەو، هەردوو بەری دەموچاویـان (واتـا لای ڕاســت و لای چــەپ) نــاڕێك و ناهاوســەنگە. ئەمانــە گرنگـــترین ئـــەو خەســڵەتە جەســتەیانەبوون كــە لومــبرۆزۆ لـــە توێژینەوەكانیـــەوە پـــێی گەیشتبوو (24).

بەلاَم خەسڵەتی ڕەفتاری تاوانبـاران بریتیـیە لەكـەمی هەســت كـردن بـەئازارو ژان بەبـەراوردكردن لەگـەڵ كەســانی ئاســاییدا، هــەروەها ســۆزو بــەزەیی مرۆڤایــەتیان نیــە و، تەمــەڵ و سســتن و، حەزلــە شــەڕەدەكەن و ئارەزوویـان لـە ئـەتك كـردن و مــەی نۆشـین و كـاری بەدڕەوشـتییەو، زۆر تـــووڕە و لـــەخۆبایی‌و خۆبـــەزل زانـــن وحـــەزیان لەتۆڵـــە ســـەندنەوەو بەدكارییە وهـەرگیز سەرزەنشتی خۆیـان ناكـەن و هەسـتی لێپرسـراوێتیان نییـە و لـەڕوی عەقڵیشـەوە لــەو ئاسـتە بـێ عـەقڵترن كەخـەڵكی هەسـتی پێدەكەن (25).

لومبرۆزۆ توێژینەوەکانی بەمە کۆتـایی پـێدەهێنێت: تاوانبـاران پۆلێکـن لـەو مرۆڤانـەی کەئـەو نیشـانە جەسـتەییانەیان پێوەدیـارەو لـەچارەیان نوسـراوە تـاوان بکـەن، بۆیـە هیـچ سـودێك لـەگۆڕینی ژینگـەو بـارو ڕەوشـی کۆمەڵایـەتیاندا نییـە وبـەهیچ شـێوەیەك کاریـان تێنـاکرێت و لەتاوان دوور ناخرێنەوە.

تـاوان جگـە لـە دیاردەیـەکی سروشـتی هیچیتـر نییـە، ئەمـە ئەودەسـتەواژەیەیە کـە لۆمـبرۆزۆ لـە کۆتـایی کتێبـی (مرۆڤـی تاوانبـار)دا نووسـیویەتی. دوای کۆتـایی هێنـان بەتیورەکـەی بـۆ خسـتنەڕوی ئـەو فاکتەرانـەی لـە پشـتی تیورەکەیـەوەن، لومـبرۆزۆ پرسـیارێك دادەڕێـژێ ودەپرسێت: بناغـەو ئەسڵی ئـەم مرۆڤـە تاوانبارانـە دەگەڕێتـەوە بۆکـوێ؟ لـەوەڵامی ئـەم پرسـیارە جەوهەریـەدا دەڵێـت: مرۆڤـی سـەرەتایی بۆخـۆی دڕنـدە بـووە و لەگـەڵ تێپـەڕبوونی زەمـەندا خەسـڵەتە ئاکـاری وپێـوەرە ئەدەبی‌یەکانی وەرگرتووە، بەڵام تاوانبار هەرمرۆڤە دڕندە سەرەتایی‌یەکەیە و کتوپـڕ ئـەو نیشانەو خەسـڵەتانەی تیـا دەردەکـەوێت کەلـەباپیرە کۆنـە دڕندەکـانیدا هـەبوون، ئـەم تیوریزەیەشـی ناونـاوە لێکەوتنـەوەی بۆماوەیی (26).

لۆمـبرۆزۆ لەسـەرەتادا تاوانبـارانی بەسـەر سـێ گروپـدا دابەشـکردبوو کـەبریتی بـوون لـە: تاوانبـار بـەزگماك و، تاوانبـاری شـێت و تاوانبـاری سـۆزاوی ، بـەڵام لـەکۆتایدا دوودەسـتەی تـری بۆئیزافـە کـردن ئـەوانیش تاوانبار بەڕێکەوت و تاوانبار بە خوونەریت بوون(27) و بـەم شێوەیە بـاس لە پێنج گروپەکە دەکات:-

- **تاوانبار بەزگماك**:

ئـەم دەسـتەیە بـەتاوانبارىی لـەدایك دەبــن و ئەوخەسـڵەتانەیان هەیــە كەلەدرێژەی تیورەكەیدا ئاماژەمان بۆكردن، بەڵام چارەسەرێك كە لومــبرۆزۆ بـۆ ئـەم دەسـتەیە پێشـنیاری دەكات ئەوەندەیـە كەبەیـەكجاری بۆدورتریــن شوێن دوربخرێنەوە تـا كۆمـەڵ ڕزگاری ببێت لێیـان و لـەهێمنی و ئـارامیدا بژی و پارێزگاری لە قەوارەی خـۆی بكات، یـان بـەند بكرێـن بـەندكردنێكی هەتاهــەتایی، یــان لەشــوێنێكی دابــڕاودا بخرێنـــە ژێــر چــاودێری یـــەكی توندوتۆكمەوە. سەرەڕای ئەم چارەسەرانە، باشترین چارەسەر بۆیان كوشتنە چونكە خۆپاراستنی تەواوەتی‌یە لێیان (28).

- **تاوانباری شێت**:

ئەوكەسەیە بەهۆی حاڵەتی شێتی‌یەكەوە بووە بە كەسـێكی مەترسـیدار، واتــا ئەگــەر شـــێت نەبووایـــە هیـــچ مەترســـی‌یەكی لێنـــەدەكرا، كەواتـــە شێتی‌یەكەی حاڵەتێكە ئەكەوێتە پێش مەترسی‌یەكەیەوە چونكە ئەو كەسە خێروشەڕ لەیەكتری جیاناكاتـەوە و، ڕەفتـارو كردەوەكـانی زۆر لـەوتاوانبارە دەچێت كەبەزگماك بۆی ماوەتەوە بـەڵام ئـەمیان حالەتەكـەی نەخۆشـی‌یەو پێویست بەچارەسـەردەكات ودەبێت بـە نەخۆشـخانەیەك یــان دەزگایــەكی چارەســـەركردن بســـپێردرێت تـــاكو بتوانرێـــت شەڕوكێشـــەو بـــەڵاكانی دوربخرێتـەوە وهاوكــات چارەســەری نەخۆشیەكەشـی بۆبكرێـت،خۆئەگــەر چارەسەری بۆنەكرا ئـەوا دەبێت لەكۆمـەڵگا دور بخرێتـەوە (29). لۆمـبرۆزۆ ئەم گروپە دەكات بەسێ‌بەشەوە:-

أ- تاوانبـــاری شـــیزی:- ئـــەو کەســـەیە کەموکورتییـــەك لـــە هـــێزە عەقڵیەکانیدایە وەك حاڵەتەکانی شیزۆفرینیا و بارانۆیا.

ب-تاوانباری فێدار: ئەو کەسەیە بە زگماك لـە ڕێی بۆمـاوەوە نەخۆشـی پەرکەم (فێ)ی هەیە، زۆرجار ئەم نەخۆشیەی دەبێت بە نەخۆشی عەقڵی ئەگەر ڵی خراپ و قورس بکات و لە کاتی خۆیدا چارەسەری پێویسـتی بـۆ نەکرێت.

ج- تاوانبـاری سـایکوباتی: ئـەو کەسـەیە کـەموکورتی و ناتەواوییـەك لـە هێزە دەروونیەکانیدایە و دەبێت بەهۆی لادانـی چالاکیـەکانی لە ڕەوتـی ئاسـایی خـۆی.حاڵــەتی سـایکۆباتی گرنگــترین حاڵەتــەکانی دواکــەوتنی دەروونیـــە و پەیوەندیـــەکی بـــەهێزی بـــەرەفتاری تاوانکاریـــەوە هەیـــە چونکە ئەم کەسێتیە توانـای کۆنـترۆڵکردنی غـەریزە و پاڵنـەرەکانی خـۆی نییە (30).

### 3-تاوانباری سۆزاوی:

ئەو کەسەیە هەستەوەرە و هەسـتیارییەکی تایبـەتی هەیـە و بـە زوویـی کارتێکراو دەبێت و ملکەچی هەڵچوون و سۆزەکانیەتی و، ڕووەوکردنی تاوان مـل دەنـێ بـەبێ ئـــەوەی پێشـتر بڕیـار وخۆئامـادە کردنـی پێـش وەختـی هەبووبێت. دوای کردنی تاوانەکە حاڵەتەکەی ئاسایی دەبێتەوەو هەسـت بـە سزا و ئەشکەنجەی خود و ویژدانی خـۆی دەکات. جـۆری تاوانەکـەش زیـاتر دەستدرێژی کردنە بۆ سەر کەسـانی تـر یـان تـاوانی سیاسـیە وتاوانبـار بـە خێرایی پەشیمان دەبێتەوە.

لۆمبرۆزۆ پێی وایە لەگەڵ ئەم دەستەیەدا سـزادان سـودی نییـە و باشـتر وایە سزا نەدرێن تاکو بەدترو خراپتر نەبن و تاوانکاریی ئەکـەن بەنـەریت.

بۆیە پێشنیار دەکات لە ژینگەی تاوانەکەی دوربخرێتەوە و ناچار بکرێت قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە کە دەرهاویشتەی تاوانەکەن، یان بڕیاری سزادانیان بۆ دەربکرێت بەڵام جێبەجێ کردنەکەی ڕابگیرێت تاکو تۆببە بکات و بە خێرایش قەرەبووی زیانەکە بکاتەوە (31).

## 4-تاوانبار بە ڕێکەوت:

ئەو کەسەیە ئارەزوویەکی ڕەگداکوتاوی نییە بۆ تاوانکردن بەڵام بەهۆی کەمی ئامۆژگاریی ئاکاریەوە وایلێهاتووە بەزوویی گۆڕانکارییە دەرەکییەکان بیوروژێنن و ناتوانێت بەرئەنجامی کار و کردەوەکانی خۆی مەزەندە بکات، بۆیە بەهۆی پاڵنەری لاسایی کردنەوە یان پاڵنەری خۆدەرخستنەوە تاوانێك ئەنجام دەدات. بۆ چارەسەری ئەم گروپە لومبرۆزۆ دەڵێت جێبەجێ کردنی سزا هیچ کەڵکێکی نییە چونکە تێکەڵ بە تاوانباری کردە و لێهاتوو دەبێ و فێری تاوان دەبێت لێیانەوە بۆیە باشتروایە لە دەوروبەرەکەی دوور بخرێتەوە و، بۆماوەیەکی دیاریکراو لە کێڵگەیەك یان کارگەیەك کاری پێبکرێت سەرەڕای قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانانەی بەهۆی تاوانەکەیەوە بەر خەڵکی کەوتوون (32).

## 5-تاوانبار بە خوو نەریت:

ئەم جۆرە بەزگماك تاوانبارنییە بەڵکو لە دەوروبەرەکەیەوە خەسڵەتەکانی تاوانباری وەردەگرێت و دەیکات بە نەریت و لە ژێر کاریگەری بارو ڕەوشی کۆمەڵایەتیدا پیادەی دەکات.تاوانەکەش زیاتر دستدرێژی کردنە بۆ سەر موڵك و سامانی خەڵکی. چارەسەریش بەوە دەکرێ بخرێتە ژێر چاودێری توندو تۆڵەوە و لەگەڵیشیدا ئاراستە و

ڕێنمایی بکرێت بۆ کاری باشە،یان کارێکی وای بۆ بدۆزرێتەوە کە مێشك و جەستەی ماندوو بکات و ڕەفتارە تاوانکاریەکەی بیربچێتەوە و تەرکی بکات. خۆ ئەگەر سودی لێ وەرنەگرت چاکتروایە لە کۆمەڵگا دور بخرێتەوە (33).

## هەڵسەنگاندنی تیۆرەکەی لۆمبرۆزۆ

ئەو پرۆگرام و میتۆدە نوێیەی کە لومبرۆزۆ لە توێژینەوەکانیدا بەکاری هێناوە،دەستپێشخەرییەکی کەم هاوتایەو کردنەوەی دەروازە بوو بۆ دەیان توێژینەوەی تایبەت بە شیکردنەوەی ڕەفتاری تاوانکاری بەپشت بەشتن بە کەرەسەی ئەزموونگەری کەلە کۆتاییدا بوو بەهۆی سەرهەڵدانی زانستی ئەنسروپولوژیای تاوان بەم شێوە زانستی‌یەی ئێستای کە گرنگی بەلێکۆڵینەوەی ڕوخسارە ئەندامی و دەروونیەکانی مرۆڤی تاوانبار دەدات(34). هەروەها بەکارهێنانی شێوازی بەراوردکردنی ئاماریی نێوان تاوانباران و کەسانی ئاسایی -گەرچی لۆمبرۆزۆ پسپۆڕنەبووە لەبواری زانستی ئاماردا- ڕێگاخۆشکەر بووە بۆ پسپۆڕوشارەزایان بۆ ئەنجامدامی توێژینەوەی زانستی ورد کەپشت بەئامار ببەستێت. کەواتە دەکرێت بڵێین:-

ئەو میتۆدەی لومبرۆزۆ بەکاریهێناوە سیمای داهێنان و ئەفراندنی پێوە دیارە، چونکە هەڵساوە بەگواستنەوەی میتۆدی زانستی ئەزمونگەری لە زانستە سروشتیەکانەوە بۆ مەیدانی زانستەکانی تاوان. سەرەڕای ئەو سەختیو دژواریانەی کەهاتونەتە ڕێی لومبرۆزۆ بەلاَم توانیویەتی سەرجەم دیدوبۆچونی زاناو توێژەرانی پێش خۆیو ئەوانەش کە هاوچەرخی خۆی بوون، بەرپەرچ بداتەوە وبییانسڕێتەوە وسەرلەنوێ ڕێگای نوێ بگرنەوە بەرو پشت بەئەزمونەکانی لومبرۆزۆ ببەستن. ئەمانەو جگە لەو شۆك و

ڕاچەنینـەی کـەدەزگاکانی دادگاو سیاسـەتی تـاوانی هـەژاندو، بـەهۆی هـزرو بۆچونەکانیەوە چەندین گۆڕانکاری لەیاساکانی تاوان و سزادا هێنایە ئـاراوە کەزۆربـــەیان لـــە زەمـــانی خۆیـــدا پراکتـــیزە کـــران وچوونـــە بـــواری جێبەجێکردنەوە.

سـەرەڕای لایەنـە بـاش و پوزەتیفـەکانی تیورەکـە، چـەندین ڕەخنـەی زانستی ئاراستە کراوە ولێرەدا ئاماژە بەگرنگترینیان ئەدەین:-

أ-ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی ڕەفتاری تاوانکاری تەنـها لـەڕوکاری پێکهاتـەی جەسـتەییەوە، لێکدانەوەیـەکی ناتـەواوەو سـەرجەم لایەنـەکانی ڕەفتـاری مرۆڤایـەتی داناپۆشێت. بـەتوێکاری کردنـی تـەرمی تاوانبارەکـان، لومـبرۆزۆ نـەیتوانیوە هـەموو خەسـڵەتە بایولوژییـەکانی ئـەو کەسـانە دەربخـات و شیکاری بکات چونکە ڕێبـازی بـەراوردکاری تـەواوەتی دەبێـت هەمەلایەنـەو گشتگیربێت.

ب- گـەرچی بناغـەی تیورەکـە پشـت بەپشـکنین و توێکـاری دەبەسـتێت، بەلاّم لەڕووی زانستییەوە هێشتا ڕاستی تیورەکە نەسەلمێنراوە، چونکە ئـەو نیشانەو سیما دەرەکیانـەی کـەتاوانباران لەکەسـانی تـر جیادەکەنـەوە نابنـە نیشانەی جیاکەرەوەو حوکمی یەکلاکەرەوەیان پێنادرێت.

ج- خەسـڵەتە بـایولوژیو دەروونیـیـەکان کـە لومـبرۆزۆ دەستنیشـانی کـردوون بـۆ جیاکردنـەوەی تاوانبـار لەکەسـانی تـرو دەڵێـت: پێویسـتە وەك تاوانبار مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێـت تەنانـەت ئەگـەر ڕەفتـاری تاوانکاریشیان ئەنجام نەدابوو، ئەم ڕاوبۆچوونە ئاستەم ومەحاڵە وناکرێت قبوڵ بکرێت و، بەتـەواوی بەڕاسـت بزانـرێت، چونکـە پـەی بـردن بـەدەروونی مرۆڤایـەتی کارێکی زەحمەت ودژوارە. ڕۆچوون بەپانیاییـەکانی دەروونـدا هەروائاسـان نیـە وهـەتا ئێسـتا توێژینـەوەی زانسـتی ومیتـۆد وڕێبـازە جیاجیاکـانی،

نــەيانتوانيوە لايەنــە ناديــارو شــاراوەكانى دەروون بخەنـــە ڕوو. مەترســـى تاوانكــارى بەڕوخســارى دەرەكــى مرۆڤــەوە نييــە بــەڵكو لــەقوڵايى نــاخ و دەروونديە. تاوان دەروونەكان دەيكەن نەك ڕوخسارەكان. دەروونــى مـرۆڤ جيهانێكە كانگاى دەيـان و سـەدان هەسـت ونەسـت و پاڵنـــەرو هەڵچوونـــەو لەكەسـێكەوە بـۆ كەسـێكى تـر دەگۆڕێـت وتەنانـەت لـەلاى يـەك كەسـيش لەكاتێكەوە بۆ كاتێكى تر گۆڕانكارى بەسەردا دێت (35).

د- سەبارەت بەناوەڕۆكى تيورەكە:- هيچ بەڵگەيەكى زانستى لەئارادانييە كەبيسـەلمێنێت مرۆڤـى سـەرەتايى نيشـانەى تاوانكـارى هـەبووە يـــان دڕنـــدە بووە وحەزى لەتاوان كردووە. ئەم لێكدانەوەيـە بۆخـۆى تـاوانێكى گەورەيـە دەرهەق بەمرۆڤى سەرەتايى چونكە توێژينــەوەكانى تايبـەت بـە بـەگروپ و خێڵە سەرەتاييىيەكان ئەوەيان سەلماندووە كـەپاكژ بـوون وڕەفتاريـان پـاك و بێگەرد بووە.

لـــەڕووى زانســـتىيەوە تـــاكو ئێســـتا دەرنەكـــەوتووە كرۆمۆســـۆمەكان خەسـڵەتى تـاوانكردن يـان ڕەفتــارى لادەر لەنەوەيەكــەوەبۆ نەوەيــەكى تــر بگوێزنەوە وئەم بەشـەى ڕەفتـار ڕاسـتتر ئـەم لايەنـەى ڕەفتـارى مرۆڤايـەتى بۆماوەيى وزگماك نييە (36).

**تیوری فسیولوژی**:

زاناکانی بایولوژیای تاوان لە توێژینەوەکانیاندا بۆ دەستنیشانکردنی ڕەفتاری تاوانکاری، ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ سەرنجی ڕاکێشاون و، بۆ هەندێکیتریش ئەرکی ئەندامەکان جێی بایەخ و گرنگی پێدان بووە. هەوڵەکانیان بەوئاقارەدا برد کەکاریگەری ژینگەی ناوەکی تاکەکەس لەسەر ڕەفتارەکانی بخەنە ڕوو. بۆیە هەندێکیان دەستیان دایە لێکۆڵینەوە لەئەرکەکانی کۆئەندامی دەماریی تاوانباران و، کۆئەندامی گلاندەکان وکۆئەندامی سێکسیو سوڕانی خوێن وهەناسەدان و...تاد. بۆئەوەی ڕۆڵی حاڵەتە پەشێویەکانی ئەو کۆئەندامانە لەسەر پێکهێنانی ڕەفتاری تاوانکاری دیاری بکەن، هەروەها ڕۆڵی تەمەن و ڕەگەزو نەژاد لەڕەفتاری تاوانکاریدا بخەنە ڕوو. لەئەنجامی کۆمەڵێك توێژینەوەدا لقێکی نوێی تاوانناسی هاتە ئاراوە بەناوی فسیولوژیای تاوانەوە Criminal Physiolgy(37). دیارترین بابەتی فسیولوژیای تاوان بەستنەوەی ڕەفتاری تاوانکاری بوو بەکوێرەگلاندو کەمئەندامی و نەخۆشی و تەمەن و ڕەگەزو نەژادەوە. لێرەدا ئاماژە بەو لایەنانە دەکەین:-

- **کوێرەگلاندەکان و تاوان**:

زۆربەی تیورە فسیولوژیەکان بەو ئاکامە گەیشتوون کە تێکچوونی هۆرمۆنی کوێرەگلاندەکان هۆکارە بۆ دروستکردنی ناتەواوی لەپێکهاتەی کیمیاوی خوێندا وئەمیش دەچێتە پێکهاتەی ئەندامەکانی جەستەوە بەتایبەتیش کۆئەندامی دەمار کەڕۆڵی ڕاستەوخۆ دەگێڕێت لەسەر ڕەفتارو

هەڵچوونـەكانی مـرۆڤ (38). لـەم ڕێگایـەوە زاناكـانی بایولۆژیـای تـاوان دەسـتیان دایـە توێژینـەوە بـۆ دۆزینـەوەی پـەیوەندی لـەنێوان تێكچوونـی ئەركی گلاندەكان و ڕەفتاری تاوانكاریو بەم ئەنجامانە گەیشتن:-

أ-كەم بوونـەوەی ڕێـژەی شـەكر لـە خوێنـدا ئەبێتـە هـۆی بزواندنـی ئارەزووی مـرۆڤ بـەلای ئـەو تاوانانـەدا كەسیمای توندوتیژیـان پێوە دیـارە (39)، لەگـەڵ تـاوانی دزیو شـەڕكردن و ڕوو بەڕووبوونـەوە لەگـەڵ پیـاوانی پۆلیسدا هەروەها سەرپێچی كردن لەیاساكانی هاتوچۆ.

ب- كـەم بوونـەوەی ڕێـژەی كالیسـیوم ئەبێتـە هـۆی بـەرپاكردنی كاردانەوەی هەڵچوونیی توندوتیژو لەوێشەوە بۆئەنجامدانی تاوانەكانی وەك دەستدرێژی كردنەسەر تاكەكەسان.

ج- تێكچون لەهۆرمۆنەكانی گلاندی دەرەقی Thyroid ئەبێتەهۆی تووش بـوون بەهـەندێك نەخۆشـی عـەقڵی ودواتریـش ئـەنجامدانی تـاوانی توندوتیژی (40).

د- لەتوێژینەوەیـەكدا كـە بـۆ 179 مـێرد منداڵی تـوش بـوو بەپەشـێوی گلانـدی نوخـامیPituitary كـراوە دەركـەوتووە 53 مـێرد منداڵیـان توشـی لادانی ڕەفتاریی هـاتوون وەك حاڵەتـەكانی توندوتیـژی مـیزاج وبـەرەڵایی و دزیكـردن و یـاخیبوون و درۆكـردن. كـاتێك بـەگیراوەی ئـەو گلانـدە چارەسەركراون ئیدی ئەو ڕەفتارانەیان نەماوە و كۆتایی هاتووە.

ئەم ئەنجامانـەی كـە توێژینـەوەكانی تـاوان لـەڕووی گلاندەكانـەوە پـێی گەیشتوون كەموكورتیان هەیە وناكرێت گشتاندنیان بۆ بكرێت چونكە ئـەو پەشـێویانەی لـە گلانـدی تاوانبارەكـاندا ڕوویـداوە، لـەلای ژمارەیـەكی زۆر لەمرۆڤی ئاسایی ناتاوانباریش هەر ڕوویانداوە وڕوودەدەن. لەلایـەكی تـرەوە زۆربەی تویژینەوەكان لەسەر ئەوتاوانبارانە ئـەنجامدراون كەماوەیـەكی زۆر

درێژیـان لـەزینداندا بەسـەربردووەو ڕەنگـە پەشـێوی گلاندەکانیـان بــەهۆی سەختی وناهەمواری ژیانی ناو بەندیخانەوە درووست بووبێت.

### - تاوان و کەم ئەندامیو نەخۆشی:

هـەندێك لـەزانایانی فسـیولۆژیای تـاوان، کـەم ئـــەندامی و ناتـــەواوی جەســـتەیی ونەخۆشـــییان بـــەڕەفتاری تاوانکاریـیـــەوە بەســـتۆتەوە وەك حاڵەتەکانی: ناشرینی ڕوخسارو کەمئەندامیو کورتەبالاًییو، نەخۆشیەکانی :سـیل و ئیفلیجـی ئـەندامێکی لـەش و نەخۆشـی تایبــەت بــە ئــەندامی سێکسـەوە....تـاد. لـەئاکامی توێژینـەوەکاندا ئامـاژە بـــەوەدەدەن کەزۆربـەی تاوانبارەکان ناتەواویەکی جەستەیی یان زیاتریـان پێوەدیـاربووە بەبـەراورد کـردن لەگـەڵ کەسـانی ناتاوانبـاردا. بەشـێوەیەکی گشـتی تاوانبـاران لـەڕووی تەندروسـتییەوە لەشساغ نـەبوون و ئەگـەری تـووش بوونیـان بەنەخۆشـی سنگ هەبووە یاخود کورتبین (قصر النظر) بوون.

زاناکـان لـە لێکدانـەوەیاندا بۆئـەم نەخۆشـی و کەمئەندامێتیانـە دەڵێـن: حاڵەتە جەستەییـیەکەیان بـووە کـەپاڵیپێوەناون ڕووە ولادان و هەسـتکردن بەکـەمی لەئاسـتی هـاوڕێ وهاوتەمەنـەکانیانداو، لـەڕووی کۆمەلاًیەتیـەوە پلەوپایـەیان لەدەســتداوە و، لــە خوێندنیـــاندا کەمتەرخـــەم بـــوون و، پەیوەندییان بە دەستەوگروپی بەدکارانەوە کردووەو، ڕوویان لە مەینۆشـیو مادەی سڕکەر کردووە، ئەم حاڵەتانەش وای لێکـردوون کـەڕێگای تـاوانکردن بگرنەبەر.

ئەگـەر بـەچاوی هەڵسـەنگاندنەوە بۆئـەم دیدوبۆچوونانـەی سـەرەوە بڕوانین دەکرێت ئەم سەرنجانە دەربڕین:-

أ- لەڕووی پرۆگــرام و میتــۆدەوە وەك پێوانــە کــردن وبــەراوردکردن، ناتەواون وکەموکورتیان هەیە وناکرێت گشتاندنیان بۆبکرێت.

ب- حاڵەتــەکانی کەمئــەندامی ونەخۆشــی لــەلای کەســانی ئاســایی ناتاوانباریش بوونیان هەیەو فاکتەرنین بۆ ئەنجامدانی تاوان.

ج- گەلێك تاوانباریش لەش ساغ بوون و هیچ نەخۆشیو ناتەواوییەك لە ئەندامەکانی جەستەیاندا نەبووە (41).

### 3- تاوان و تەمەن:

لــە ڕووی فســـیولۆژیەوە گومـــانی تێدانییـــە کـــە ڕادەی کارلێکـــە کیمیاوییەکانی نێو ژینگەی ناوەکی تاکەکەس لە تەمەنێکەوە بـۆ تەمـەنێکی تـر دەگۆڕێت و، هـێزو توانـا و چالاکی و پەرچـەکردار و هەڵچوونـەکان لــە قۆناغێکی تەمەنەوە بۆ قۆناغێکی  تـری تەمـەن گۆڕانکاییـان بەسـەردا دێـت (منداڵــی،هــەرزەکاری، لاوێتــی و پێگەشــتن و پــیرێتی). توێژینـــەوەکان دەریانخستووە: ڕێژەی تاوان لە قۆناغێکی تەمەندا زۆرە و لە قۆنــاغێکیتردا دێتەخوارەوە (42).

هەندێك لە توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە بەرزترین ڕادەی  تـاوان دەکەوێتە نێوان تەمەنی (18-25) ساڵانەوە. هەندێکی تر دەڵێن ڕێژەی تاوان لەقۆناغی هەرزەکاریدا دەگاتــە لوتکە، بەتایبـەتی لـەنێوان تەمـەنی (14-17) سـاڵیداو پاشـان وردە وردە دادەبـەزێت ولەگـەڵ بەرەوســەرچوونی تەمــەندا دەگاتە کەمترین ڕادە بەتایبەتی لەدوای تەمەنی پەنجا ساڵیەوە (43).

ئاکامی ئەو  توێژینەوانـەی بۆدەرخسـتنی پـەیوەندی تـاوان بەتەمەنـەوە ئــەنجام دراون دەڵێــن: تاوانـــەکانی دزینـــی ئۆتۆمبێــل وماڵــبڕین لـــەلای هەرزەکاران زۆرەو، تاوانە  سێکسیەکان لـەلای هـەرزەکاران و لاوان و پـیران

هەیەو ڕادەیان بەرزە و، تاوانی توندوتیژی لەقۆناغی لاوێتی نێوان (18-30) ساڵیدا ڕێژەکەی بەرزە و، تاوانی کوشتن لەقۆناغی پێگەیشتندا: {(18) وەك سەرەتاو (25) وەك لوتکەو (40) وەك کۆتاییی}(44)، لەوپەڕی ڕادەو بەرزیدایە.

شایەنی باسە تاوانەکان لەقۆناغی هەرزەکاری ولاوێتیدا کەبەو ڕێژەبەرزە بونیان هەیە ولەقۆناغی کامڵ بوونیو پیرێتیدا کەمدەبێتەوە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەقۆناغی هەرزەکاری ولاوێتی بەقۆناغی زیادبوونی هێزوچالاکیو هەڵمەت و هەڵچونەکان دەناسرێتەوەو، هەرزەکار لەڕووی دەروونییەوە شێواوەو غەریزەو سۆزەکانی نائارام و ناجێگیرن ومیزاج و حەوسەڵەی هێمن نیەو کەمتەرخەم و کەم سەرنجەو، هەڵپەی بۆ ڕەگەزی بەرامبەرو سێکس هەیەو، وەلاّم بەکەرەسەکانی لە خشتەبردن وفریودان دەداتەوەو، دەروون و هەوەس وحەزەکانی خۆی بۆ کۆنترۆڵ ناکرێت (45)، (46). ئەم حاڵەتانەش لەقۆناغی کامڵ بوون و پیرێتیدا پێچەوانە دەبنەوە، بەلاّم ئەم قۆناغانەش تاوانی تایبەت بەخۆیان هەیە ومرۆڤ نابێتە فریشتەو پەری تیایاندا، تاوانەکانیش وەك: شاردنەوەی شمەکی دزراو، ڕێگری و، تاوانی سێکسی و، شکاندنی هەندێك لەیاساکان. لەقۆناغی پیرێتیدا تاوانی سێکسی دژ بەمندالاّن بەڕادەیەکی بەرچاو ئەنجام دەدەرێت.

تەمەنی پیری قۆناغێکە گۆڕانکاری لە سۆزو هەستەکاندا ڕوودەدات و مرۆڤ هێمن وئارام نییەو بەئاسانی کۆنترۆڵی دەروونی خۆی پی ناکرێت وزۆرجاریش بێئیشی والەمرۆڤی پیر دەکات ڕووەوتاوان هەنگاو بنێت(47).

**4-تاوان وڕەگەز**:

ئامارەکانی تاوان لەزۆربەی وولأتانی جیهاندا دەریانخستووە کە ڕێژەی تاوانەکانی ژنان لەتاوانەکانی پیاوان کەمترە بەڕادەیەك دەکەوێتە نێوان 10٪-20٪ ەوە جگە لەو تاوانانەی تایبەتن بەسروشتی ژنەوە وەك حاڵەتەکانی لەباربردنی کۆرپەلەو کوشتنی منداڵی ساوای تازە لەدایك بوو (48).

تاوانەکانی توندو تیژیو لێدان وبریندار کردن ووێرانکاری لەلای ژنان لەکەمترین ئاستدایەو لەبەرامبەر تاوانەکانی دزینی پارەو ئاڵتون وناپاکی کردن لەئەمانەت وشاهێدی ساختەو سوێند خواردنی درۆو تاوانی ئاودیو کردن (التهریب) (49).

لەڕاڤەکردن ولێکدانەوەی کەمی تاوانی ژناندا، زاناکانی فسیولوژیای تاوان پێیانوایە بنەمای بایولۆژی ژینگەی ناوەکی لەنێوان پیاو وژن و جودایی توانای جەستەیی، هۆکاری ڕاستەقینەن ودەڵێن: ژنان لەڕووی هێزی ماسولکەوە هەردەم لەپیاوان لاواز تر بوون و بالأیان کورتترو کێشیان کەمتر بووە جگەلە حاڵەتەکانی تایبەت بە فسیولۆژیای ژن وەك دووگیانی و منداڵبوون و سوڕی مانگانە. هەرلەم بارەیەوە لومبرۆزۆ پێیوایە ئەگەر تاوانەکانی داوێن پیسی و بەدڕەوشتی ژنان بخرێنەسەر تاوانەکانی تریان ئەوکاتە ڕێژەی تاوانی ژنان وتاوانی پیاوان وەك یەکیان لێدێت.

سەبارەت بەم تیورە ئەم ڕەخنانە دەخەینە ڕوو:

- هەندێك تاوانی توندوتیژی پێویستی‌یان بەهێزی جەستەیی‌نییەو ژنانیش دەتوانن ئەنجامی بدەن، زۆر جار کوشتن لەڕێی ژەهراوی کردنەوە ئەنجام دەدەرێت.
- ئەگەر ژن ڕۆڵی سەرەکی‌و ڕۆڵی بکەر لەتاوانی توندوتیژیدا نەبینێت خۆ دەتوانێت ڕۆڵی یاریدەدەرو ناوەندی ببینێت.
- زۆربەی تاوانە گەورەکانی وەك دزینی پارەو ماڵ و ساختەکردن وشاهێدی ودرۆو.....تاد، ئەمانە هێزێکی جەستەیی گەورەیان ناوێت وحاڵەتەکانی دووگیانی وسوڕی مانگانە ڕێ لەژن ناگرن بۆکردنیان.
- هەندێك لەتوێژەران لەوباوەڕەدان تاوانی ژنان لەماوەی سوڕی مانگانەدا ڕێژەکەی زیاد دەکات و بەرزدەبێتەوە (50).

دەکرێت بڵێین: نزمی ڕێژەی تاوانی ژنان لەئاست پیاواندا دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە کۆمەڵایەتیەکانی وەك: کەمی چالاکی کۆمەڵایەتی‌و نەچونەدەرەوەی ژن لەماڵ و، بەرەنگار نەبوونەوەی ژیان لەدەرەوەی بازنەی ماڵ و خێزاندا، ژنانی کارگەر کەمترن لەپیاوان ولێپرسراونین لە بژێوی وگوزەرانی خێزانەکانیان. بەلاَم لەکاتی قەیرانی ئابووری‌و جەنگەکاندا، تاوانی ژنان زیاتر دەبێت هەروەها لەو ولاَتانەشدا کەڕادەی هاتنەدەرەوەی ژن بۆ بوارەکانی ژیانی پراکتیکی زیاترە بەهەمان شێوە ڕێژە تاوانی ژنیش بەرزدەبێتەوە.

### 5-**تاوان ونەژاد**:

ئاشکرایە لەناوچە جیاجیاکانی سەرزەوی چەندین نەژادی مرۆڤایەتی جیاواز هەیە وەك سپی پێست ورەش پێست، ئەسکەندیناڤی‌و ئەفریقی‌و یابانی‌و ....تاد، ئەم نەژادانە ڕواڵەت و ڕوخساری دەرەکییان لەیەك ناچێ

لەشێوەی سەرو ڕەنگی پێست و چاوو قژو موو بالاَوکێش....تاد، جودان لەیەکتر هەروەها لەشێوازی بیرکردنەوەو ڕەفتارو میزاج وداب ونەریتدا لەیەکتر ناچن. ئەم جیاوازیانە سەرنجی زاناکانی تاوانی ڕاکێشاوە وچەندین توێژینەوەیان بۆ ئەنجامداوە وبەم ئاکامانە گەیشتوون:

لەلای ڕەشپێستەکان تێکڕای تاوانەکانی توندوتیژی بەرزە، هەروەها هەمان تاوان لەلای دانیشتوانی حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست لەئاستێکی بەرزدایە. بەلاَم تاوانەکانی دارایی‌و دزینی پارەومالَی خەلَکی لەلای دانیشتوانی ناوچەکانی باکوری زەوی زیاترە. ئەمەش وا لێکدەدەنەوە کەجیاوازی فسیولوژی لەنێوانیاندا هەیە. سەبارەت بەزیادبوونی ڕێژەی تاوانی ڕەش پێشتەکان دەلێن هۆکارەکانی دەگەڕێنەوە بۆتوندوتیژی میزاج وخێرایی هەلَچوون و پەلاماردان وبێتواناییان لەکۆنترۆلَ کردنی دەروون و هەست و سۆزەکانیان (51).

لەکۆتایدا پێویستە بوترێت لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا ئەم ڕاوبۆچۆنانە (تایبەت بەپەیوەندی تاوان ونەژاد) بەتەواوی بەدرۆخرانەوەو لەئاست ڕەخنەکاندا هیچیان پێنەکرا. چونکە جیاوازی نەژادەکان دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ژینگەو دەوروبەرو ڕەوشی کۆمەلاَیەتی‌و ئابوری‌یەکانی کۆمەلَگا. تێکرای تاوانیش لەنەژادێکەوە بۆ نەژادێکی تر بەهۆی بارو ڕەوشی دەرەکی‌یەوەیە کەئەونەژادە جیاوازانە لەمێژوویەکی درێژخایەندا پیایدا تێپەڕیوون وەك خراپی باری ئابوری ملیونەها ڕەش پێست لە ولاَتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.

## تیوری زگماك (بۆماوە):

بۆماوە پرۆسەیەكی ئەندامییەو لەساتەوەختی پێكهاتنی زینــدەوەردا لەرژێمێكی زۆرئــاڵۆزدا بــەڕێوە دەچێـت و، هــەتا ئــەمڕۆ زانسـت تیشـكی نەخستۆتە سەرهەموو لایەنەكانی. دۆزینەوەی یاساكانی بۆماوە دەگەڕێتەوە بۆ زانای نەمساوی جۆهان گریگۆر مەندل Johan Gregor Mendel.

پرۆسـەی بۆمـاوە لـەلای مـرۆڤ بـەم شـێوەیە بـەڕێوە دەچێـت: لـەتۆوی پیاووهێلكــەی ژنـــدا 23 جــوت كرۆمۆســۆم هەیــە كەهــەڵگری فاكتـــەرە بۆماییـیـەكانن واتـا بۆهێڵـەكان (Genes). كـاتێك تـۆو هێلكـە بەیەكدەگـەن خانەیەكی نوێ پێك دێت (زایگـۆت) كەلـە23 جووت كرۆمۆسـۆم پێكهاتووە، هـەرجووتێك لـەدوولا پێكدێ، لایـەكیان لـەنێرەوە دێـت و لایەكـەی تریــش لەمێیەوە. بەهۆی ئەم بەیەكگەیشتنەوە بۆهێڵەكان لەگـەڵ یـەكتردا كـارلێك دەكەن وئاوێتە بەیەك دەبن وخەسڵەتەكانی باوان (باوك ودایك) بـۆ منـداڵ دەگوێزنەوە بەپێی جۆری بۆهێڵەكانیان (52). ئەگەر هاتوو لـەلای هـەردوو ڕەگەزەكـە بۆهێڵـەكان چـوون یـەك بـوون ئـــەوا كۆرپەلــە ئەوســـیفاتانە وەردەگرێت كەلە بۆهێڵەكاندا هەیە. بەلاّم ئەگەر لـەلای هـەردوو ڕەگەزەكـە بۆهێڵەكان جیاواز بوون ولەیەك نەچوون، لەم حاڵەتەدا ڕەوشەكە دەگۆڕێت لــــەنێوان ســــیفەتی بــــاو (زاڵ Dominant)و ســــیفاتی ناپـــــەیوەنددار (دورخراوە Recessive).

لەحاڵەتی سیفاتی باودا، وەك یەكگرتنی ڕەنگی ڕەش لەگەڵ ڕەنگی سپیدا یان چاوی ڕەش لەگەڵ چاوی شیندا، یان گروپی خوێنی A ,B لەگەڵ گرپی o دا، ئەوكاتە سیفاتە باووزاڵەكە لەمنداڵەكەدا دەردەكەوێت، بەلاَم ئەگەر سیفاتەكە ناپەیوەندار بوو، وەك ڕەنگی سپیو ڕەنگ كوێریو نەخۆشی شەكرە...تاد. ئەوا لە منداڵەكەدا دەرناكەوێت مەگەر لەگەڵ سیفەتێكی ناپەیوەنداری هاوشێوەی خۆیدا (لەڕەگەزەكەی بەرامبەر) یەكبگرێت. لەهەموو حاڵەتەكاندا ئەو سیفاتەی لەمنداڵی یەكەمدا دەرناكەوێت لە منداڵی دووەم یان سێیەمدا دەردەكەوێت وبۆهێڵەكانی پێكهێنەری یەكێك لەسیفەتەكان دەگوێزرێتەوە بۆمنداڵ بەبێئەوەی سیفاتەكەی تیادا دەربكەوێت وڕەنگە لەباروڕەوشێكی لەباردا، لەنەوەكانیدا دەربكەوێت. مەرج نیە هەموو كاتێك بەیەكگەیشتن و ئاوێتەبوون لەنێوان بۆهێڵەكاندا ڕوودبدات بۆیە سیفاتەكان دەرناكەون، ئەم حاڵەتە لەوانەیە بۆچەند نەوەیەك درێژە بكێشێت ولەوانەشە بەیەكجاری شوێنەواری نەمێنێت وبسڕێتەوە (53).

زاناكانی تاوان لەبەرامبەر پەرەسەندنەكانی بواری زانستی بۆماوەدا دەستەوەستان نەبوون و گریمانی (پێكهاتنی تاوانكاری بۆماوەیی) یان داڕشتووەو هەوڵیان داوە بەچەند ڕێگایەك ئەو گریمانەیان بسەلمێنن وەك لە بوارەكانی: لێكۆڵینەوەی خێزانە تاوانبارەكان و، توێژینەوەی ئاماریی بەراوردكاری بۆ تاوانەكانی باوان ومنداڵەكانیان و، توێژینەوەی كرۆمۆسۆمە سیكسیيە زیادەكان و، پراكتیزە كردنی یاساكانی مەندڵ بەسەر ڕەفتاری تاوانكاریدا. لێرەدا ئاماژە بۆهەندێك لەولایەنانە دەكەین:

**یەکەم: لێکۆڵینەوەی خێزانە تاوانبارەکان:**

ئـەم جـۆرە لێکۆڵینەوانـە لەوکاتـەوە سـەریان هـەڵداوە کـە لەیـەکێك لەبەندیخانـەکانی ویلایـەتی نیویورکـدا سـاڵی 1874شـەش بـەندکراو لەزیندانەکەدا بوون و هـەمویان ئـەندامی یـەك خـێزان بـوون، ئـەم حاڵەتـە سەرنجی هەردوو زانای ئەمریکی (ڕیچارد دۆگدیل و ئارتورئیستابرۆك R .L Dugdale - C.A.H Estabrook .)ی ڕاکێشاو وای لێکـردن بـەرەگ وڕیشـەی ئەوخێزانـەدا بچنـەخوارەوە تـا گەیشتنە کەسێتی ڕاگـری ئـەو بنەماڵەیـە (ماکس جوکسMax Jukes ) ئەم کەسە لەساڵی 1720دا لەدایك بووە وباوکی ئـەڵمانیبووە. بـاوکی مـاکس لەئـەڵمانیاوە بـۆ ولاتـە یـەکگرتووەکان کۆچـی کردووە ولەویلایەتی نیویورك نیشتەجێ بـووە. مـاکس هـەر لـە منداڵیـەوە خەریکی ڕاوبـووە و بـەوە ناسـراوبووە کـەخولیای مـەی نۆشـین و ڕابواردنـی سێکسی لەگـەڵ ژنـاندا هـەبووە، پاشـان (ئـادا یالێکسـی) خواسـتووەو بـوە بەهاوسەری، ئەوژنە دزێکی کارامەو لێهاتوو بوەو چەندین منداڵ و نەوەیان لێکەوتۆتەوەی (54).

ریچـارد دوگدێـل لـەدوای گـەڕان وبـەدواداچوندا توانـی (709) کەسـی ئەوبنەماڵەیـە کەلـەماوەی حـەفتا ساڵدا ژیـاون، بدۆزێتـەوە. پاشـان ئیسـتا برۆکی هاوکاری دوگدێل هەتا ساڵی 1915 درێـژەی بـەم بـەدوادا چونـە داوە، بـەتێکڕایی توێژینـەوەیان بـۆ (2094) کەسـی ئـەو بنەماڵەیـە کـردووە. لەئـەنجامی لێکۆڵینەوەکـەیاندا بـەم ئاکامانـە گەیشتوون: زۆربـەی منداڵانـی ئەوبنەماڵەیە زۆڵ (غیر شرعی) بوون ولەگەورەبووندا ئەم کەسێتیانەیان لێ دەرچـووە: دزی لێـهاتوو کارامـە، پیـاو کـوژ، بـەرەڵا، ئـالودە بەنۆشـینی

شـەرابەوە، داوێـن پیـس، نەخۆشی عـەقڵی، نـەزۆکی، ونەخۆشـی سێکسـی، گەواد، شایەنی باسە دۆگدێـڵ لـە نێو تاکـەکانی بنەماڵەی جۆکس دا (280) سـواڵکەرو (60) دزی کارامـەو (7) پیـاو کـوژو (140) تاوانبـاری هەمـەجۆرو (50) بەدڕوشـت و (300) منداڵی نەبەکە (ئـەو منداڵانـەی لـەپێش واتـەی سروشتیدا لەدایك دەبن) و (440) کەسی توش بوو بەنەخۆشی ئەندامەکانی زاووزێ، هەبوون (55).

پێویستە بگوترێت ئەو زیانە مادیـەی کەبـەهۆی ئەوبنەماڵەیـەوە بـەر ویلایەتی نیویورك کەوتووە نزیکەی (000ر308ر1) دولار بـوو جگـە لـەزیانی ماددیتر کەنەهاتۆتە هەژماردن.

زانـای ئـەمریکی هێـنری گـۆدارد Henry H.Goddard توێژینەوەیـەکی هاوشـێوەی لەسـەر بنەماڵەی کالیکـاك Kallikak کـردووە. مـارتن کالیکـاك لـەکاتی شۆرشـی ئـەمریکادا سـەربازبووە، ئەودەمـەی لەخزمـەتی سـەربازیدا بـووە کچێکـی کـەم عـەقڵی ناسیوەو پـەیوەندی سێکسـی لەگـەڵدا بەسـتووە ولەئـەنجامدا منداڵێکـی زۆڵیـان بـووە، لەومنداڵـەوە بنەماڵەیـەکی گـەورە کەوتۆتـەوە کـە گۆرداردی توێـژەر لـە(480) کەسیانی کۆڵیوەتـەوە. لـەکاتی شۆڕشدا مارتن گەڕاوەتەوە بۆشارەکەی خۆی ولـەوێ ژنێکـی خواسـتووە ئـەم ژنە نوێیەی ناوبانگێکی باش و پەسەندی هـەبووە ووەك پیشـەش مامۆسـتا بـووە، لـەم ژنـە نوێیـەوە بنەماڵەیـەك کەوتۆتـەوە کـە گـۆدارد لـە (496) کەسیانی کۆڵیوەتەوە. گۆدارد لەئاکامدا دەڵێت:

لـەژن و بنەماڵەکەی یەکەمـەوە: ژمارەیـەکی زۆر منداڵـی زۆڵ و، کـەم عەقڵ و، تاوانبارو، ئالودەبەمـەیو، بەدڕەوشـت و لادەری سێکسـیو ئەوانـەی کەماڵی خۆیان دەکەنە بەدخانەو لانکی بەدڕەوشتی...تاد پـەیدابوون. بـەلام لـەژن وبنەماڵـەی دووەم: بەشـێوەیەکی گشـتی نـەوەکان ئاسـایی دەرچـوون

وهەندێکیشیان بوون بەدادوەر وپارێزەرو پزیشك، جگەلەدوانیان کەیەکێکیان ئالودەی مادەی کحول و ئەوی تریش نەخۆشی عەقڵی هەبووە (56)، (57).

جگە لەم دووتوێژینەوەیە چەندین توێژینەوەی هاوشێوە ئەنجام دراون وەك بنەماڵەی فکتۆریاو زیرۆس...تاد. لەئاکامدا هەمان ئەنجامیان بەدەست هێناوە.

بەلای لایەنگرانی تیوری بۆماوەوە، بنەماڵەی تاوانباران بەڵگەیەکی بەهێزە بۆمانەوەی پێکهاتەی تاوانباری لەنەوەیەکەوە بۆنەوەیەکیتر بەتایبەتی ئەگەر بەراوردبکرێن لەگەڵ بنەماڵەی ئاسایی‌دا وەك بنەماڵەی قەشە جۆناسان ئەدوارد J.Eedward کەلەناو نەوەکانیدا بەهیچ جۆرێك تاوانبارو شێت و بەرەلاَ نەکەوتۆتەوەو هەندێکیشیان گەیشتونەتە پۆستی سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وحاکمی ویلایەتەکان وگەلێك نوسەرو ئەدیب و بیریارو پارێزەرو پزیشك هەڵکەوتوون.

هەڵسەنگاندنی ئەم تیورە:

لەهەڵسەنگاندنی لێکۆڵینەوەی خێزانە تاوانباراکاندا دەکرێت بڵێین: لایەنگرانی تیوری بۆماوە بەهەڵەیەکی بابەتی‌و زانستی گەورەدا تێپەڕیون لەڕووی پرۆگرام ومیتۆدەوە، چونکە ژمارەیەکی ئەوتۆیان لەبنەماڵەکان نەخستۆتە ناو توێژینەوەکانەوە تاکو بتوانرێت گشتاندینیان بۆبکرێت لەدارشتنی یاسای بۆماوە لەپێکهێنانی ڕەفتاری تاوانکاری‌دا، هەروەها فاکتەری ژینگەیان بەتەواوەتی دورنەخستۆتەوە وکاریگەری ژینگە تێکەڵ بەکاریگەری بۆماوە بووە. لەلایەکی ترەوە شیکاری وردیان بۆئەو بنەماڵانەش نەکردووە کەتوێژینەوەیان بۆ ئەنجام داون، بۆنموونە لەبنەماڵەی قەشە جۆناسان ئەدواردا دەرکەوتوە ژمارەیەك ئەندامیان

تۆماری تاوانكارییان هەبووە ، هەروەها نەنكی دایكی جۆناسان داوێن پیس و بێ ڕەوشت بووە، پورێكی باوكیشی كوڕێكی خۆی كوشتووەو، مامی باوكیشی برایەكی خۆی كوشتووە.

لەڕووی بابەتەوە هەڵەی سەرەكی تیوری بۆماوە دەگەڕێتەوە بۆ لێكچوون وكۆكردنەوەی ڕەفتاری تاوانكاری لەلای ئەو بنەماڵانە لەیەك فاكتەردا كەبۆماوەیە بەبێئەوەیچۆنیەتی گواستنەوەی سیفات لەباپیرە گەورەوە بۆنەوەكان ڕوون بكریتەوە، هەروەها چۆنیەتی دابەش بوونی ئەم سیفاتانەش بەسەر نەوەكاندا دیاری نەكراوە . ئەم لەیەكچوونەی كەلایەنگرانی تیوری بۆماوە دەیگەڕێننەوە بۆفاكتەری بۆماوە ڕەنگە هۆكارەكەی فاكتەری ژینگەیی ولەیەكچونی بارورەوشی كۆمەڵایەتیو ئابووری بێت، چونكە هەموو ئەندامەكانی ئەو خێزانانە تاتەمەنێكی دیاری كراو لەنێو یەك ژینگەی هاوبەشدا ژیاوون.

زانایەكی وەك دالیسترۆم Dahlstromهەڵساوە بەدورخستنەوەی شەش منداڵ (ڕاستەوخۆ دوای لەدایك بوونیان) لە خێزانێك كەچالاكی تاوانكارییان هەبووە، لەئاكامدا وەك هەرهاولاتییەكی ئاسایی ڕەفتاریان كردووەو تاوانیان ئەنجام نەداوە، لەهەمان كاتدا دوومنداڵی لەدوای تەمەنی حەوت ساڵیەوە لەخێزانێكی تاوانكاردا دورخستۆتەوە، بۆی دەركەوت كەئەو دوومنداڵە لەژیانی ئایندەیاندا كردەوەی تاوانكارییان ئەنجامداوە (58).

## دووەم: توێژینەوەی ئاماریی بەراووردکاریی بـــۆ تاوانـــەکانی باوان ومندالّەکانیان:-

چەند زانایەکی وەك شارل گۆرینگ Goringوفرانسیس گالتون Galtonو کارل پیرسون Person، ڕێگایەکی ئامارییان گرتۆتەبەر بۆ پێوانەکردنی ڕادەی لەیەکچوونی تاوانەکان لە نێوان باوکان و مندالّەکانیان و براکانیاندا، بۆدۆزینەوەی بۆماوەی ئامادەباشی تاوانکاری. ئەم زانایانە لەکۆتایی توێژینەوەکەیاندا دەڵێن: ئامادەباشی تاوانکاری لەڕێی بۆماوەوە دەگوێزرێتەوە هەروەك چۆن خەسڵەتە جەستەیی و عەقڵیەکان دەگوێزرێتەوە وەك درێژی باڵاو ڕەنگی پێست و چاووقژو نەخۆشییە جەستەییو عەقڵییەکان.

بۆزیاتر جەخت کردنەوەو دەرخستنی کاریگەری فاکتەری بۆماوە، گورینگ فاکتەری ژینگە لە توێژینەوەکانیدا کۆنترۆڵ دەکات ودوری دەخاتەوە لەوبارەیەوە دوو بەڵگە دەهێنێتەوە:

- تێکڕای پەیوەندداری لەتاوانەکانی دزی کردندا کەهەردەم مندالان تیایدا لاسایی باوکیان دەکەنەوە؛ نزمترە لەتێکڕای پەیوەنداری لە تاوانە سێکسییەکان کەباوکان هەمیشە لەمندالّەکانیانی دەشارنەوە.
- ئەومندالانەی لەتەمەنێکی کەمدا دادەبڕێن بەهۆی زیندانی کردنیانەوە، کەچی زیاتر سوورن لەسەر ئەنجامدانی تاوان ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەلّ ئەومندالانەدا کەلەتەمەنێکی گەورەتردا لەباوکیان دادەبڕێن ودوردەکەونەوە.

هەروەها گورینگ لاوازیو کەمبایەخی ڕۆڵی باروڕەوشی کۆمەلأیەتی لەتاوانکردندا پیشاندەدات وەك حالەتەکانی هەژاری ونەزانی ودابەزینی ئاستی گوزەران ودەلێت: ڕۆڵی ئەم ڕەوشانە زۆرلاوازن لەخولقاندنی لێکچوونی نێوان تاوانەکانی باوکان ومنداڵەکانیان، بەشێوەیەك ئەوەندە لاوازە کەناکرێت لەگەڵ ڕۆڵی سەرەکی فاکتەری بۆماوەدا بەراورد بکرێت.

لەهەڵسەنگاندنی توێژینەوەی ئاماریی بەراوردکاریی نێوان تاوانەکانی باوان ومنداڵەکانیاندا دەکرێت بڵێین:

گەرچی گورینگ هەوڵیداوە بەو هەلأنەدا نەڕواتەوە کە لەڕووی میتۆدەوە کەسانی پێش خۆی پیایدا تێپەڕیون و، ڕێگای ئاماری بەکارهێناوە و، بەشێوەیەکی بەرفرواوان فاکتەری ژینگەی کۆنترۆڵ کردووە، بەلأم هێشتا ڕەخنەی لێدەگیرێ وکەوتۆتە چەندین هەڵەوە، چونکە لەتوێژینەوەکانیدا تەنها ڕەگەزی نێری وەرگرتووە وڕەگەزی مێینەی فەرامۆش کردووە،هەروەها بەتەنها چەند فاکتەرێکی ژینگەیی وەرگرتووە کەبەشێکی کەم لەپێکهێنەرەکانی ژینگە پێکدەهێنن.

لەتاوانەکانی دزیو سێکسدا بایەخی بەگواستنەوەی شێوازە تەکنیەکیەکانی ئەنجامدانی تاوانداوە لەباوکەوە بۆمنداڵ، لەبەرامبەردا گواستنەوەی بەها گشتییەکانی فەرامۆش کردووە کە گرنگییەکی گەورەیان هەیە. بەلای گورینگەوە کەمندالأن دەخرێنە نێودامەزراوەکانی چاککردنەوە ئیدی لەناوەندەکانی تاوانکردن دوردەکەونەوە، لەڕاستیدا مێردمندالأن کەتن وتاوانکردن لەنێوئەو دامەزراوانەشدا فێردەبن و فێردەکرێن هەروەك چۆن لەژینگەی تریشەوە فێریدەبن.

<u>بەشێوەیەکی گشتی سەبارەت بەبۆماوە ئەم ڕاستیانە دەرکەوتوون:</u>

ئەگەری گواستنەوەی هەندێ سیفاتی جەستەیی لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی ترهەیە بەلاّم هەتا ئەمڕۆ ئەوە نەسەلمێنراوە ویەکلایی نەبۆتەوە کەفاکتەری بۆماوە پەیوەندی بەڕەفتاری تاوانکاری‌یەوە هەبێت. هەمووئەو یاسایانەی کەزاناکانی بایولوژیا لەبۆماوەدا پێی گەشتوون وسەلماندوویانن، جەخت لەسەر گواستنەوەی چەند سیفاتێکی ئەندامی دیاریکراوو زانراو دەکەنەوە لەنەوەیەکەوەبۆ نەوەیەکی‌تر وەك: درێژی بەژن وبالأو ڕەنگی‌پێست و چاو...تاد، یان هەندێ نەخۆشی وەك کەمخوێنی وڕەنگکوێری‌و پەرکەم وشەکرەو، هەندێك جۆرلەبەرزبونەوەی فشاری خوێن وپوکانەوەی ماسولکەکان. بەلاّم ڕەفتاری تاوانکاری سیفاتێکە لەسروشت وپلەکانی‌دا دیاریکراونیە وەك سیفاتە ئەندامیەکان بەڵکو شێوەیەکەلە شێوەکانی ڕەفتاری مرۆڤایەتی ولەچەندین چەشندا و بەشێوەی جیاجیاو گۆڕاوودا دەردەکەون، ئاستەمە لەیەك چەشن وسیفاتدا کۆبکرێنەوە تاکو بتوانرێت ئەگەری گواستنەوەیان لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەکانی‌تر بسەلمێنرێن.

لەلایەکی ترەوە بۆماوە پرۆسەیەکی ئەندامی‌یە بەلاّم تاوان مەسەلەیەکی ترە و یاساکان (پسپۆرە یاسایی‌یەکان) داستنیشانی دەکەن ولەجەوهەردا بەجیاوازی کات وشوێن گۆڕانی بەسەردا دێت، بۆنموونە ئەو کردەوەیەیەی ئەمڕۆ بەتاوان دادەنرێت ڕەنگە لەڕۆژگارێکی‌تردا ئاسایی بێت وبەتاوان هەژمار نەکرێت و، ڕەنگە لەولاّتێکدا سزای بۆ دانرابێت و لەولاّتێکی تردا ڕێی پێدرابێت.

تاوانبار سەرپێچی لەهەموو یاساکان ناکات وهەموو تاوانەکان ئەنجام نادات، ئەم ڕاستیانە چۆن لەگەڵ تیوری بۆماوەدا یەکدەگرێتەوە کەدەڵێت:

سـيفاتەكان لەسـاتەوەختی یەكـەمی دروسـت بوونـی زایگۆتـدا (هێلكــەی پیتێنـراو) دەگوێزرێنـەوە. تەنانـەت ئەگەر گریمانی ئەوەشمان كرد كەهەندێ كەس خەسڵەتی سروشتییان بۆدەگوێزرێتەوە ووایان لێدێت ئارەزوومـەندبن بۆ سەرپێچیكردن لەیاساكان، ئەوا ئەوخەسڵەتانە تاكو ئێستا نادیارن وتەنها گریمانـــەن وتیـــوری بۆمـــاوە هیـــچ بەڵگەیـــەكی بـــۆ ســـەلماندنیان نەداوە پێمان (59).

دوای ئـەوەی تیـوری بۆمـاوە نـەیتوانی دەرەنجامـەكانی بەسـەر ڕەفتـاری تاوانكـاریدا بسـەپێنێت، ئـەم شكسـت هێنانــە پـاڵی بەهــەندێك لــەزاناكانی تاوانـەوە نـا كـەبۆماوەو ژینگە ئاوێتـە بەیـەكتر بكـەن وبڵێـن: ئامادەباشـی تاوانكاری بریتیيە لەسیفەتێكی بۆماوەیی یان لانیكەم (هێز) ێكی شاراوەیە لەنێو زایگۆتدا وئەشێت لەژینگەیـەكی لـەباردا گەلاڵـە ببێـت بـۆ پێكهێنانی كەسێتی تاوانبـار. بـەلام ئـەم بۆچوونــەش هــەتا ئێســتا هــەر گریمانەیــەو پێویستی بەبەڵگەیە بۆپاڵپشتی كردن وسەلماندن.

## **سێیەم**: **توێژینەوەی كرۆمۆسۆمە سێكسییە زیادەكان**:

لــەدوای جــەنگی جیـهانی دووەمــەوە ســەرنج و بۆچوونــەكان بــەلای كرۆمۆسـۆمە سێكسـییە زیادەكـاندا رۆیشــتن بەمەبەسـتی دەرخســتنی كاریگـەری وشــوێنەواریان لەپێكـهێنانی ڕەفتــاری تاوانكــاریدا. زاناكــانی بایولوژیا ئەم دەروازەیەیان كـردەوە بـۆ گـەڕان بـەدوای كەرەسـەیەكی نوێـدا تـاكو شـارەزایانی بـواری تـاوان ســودی لێوەربگـرن بەلێكدانــەوەی ڕەفتـاری تاوانكاریدا.

ئاشكرایە زایگۆت هەڵگری 23 جووت كرۆمۆسۆمەو، جووتێكیان تایبەتـە بەدیاریكردنی ڕەگـەزی كۆرپەلـەوە. ئـەم كرۆمۆسـۆمە لـە مێینـەدا هـەڵگری

سـيفاته مێينەکانـەو لەشـێوەی ( x x ) دەردەکـەون ولەنێرینـەدا هـەڵگری سیفاتە نێرینیەکانەو یەکێکیان لەشێوەی ( x) وئـەویتریان لەشـێوەی ( Y) دا دەردەکەوێت. کرۆمۆسۆمی ( Y) لەنێو هێلکەی پیتێنراودا ڕەگەزی نـێری کۆرپەلە دەستنیشان دەکات.

زاناکـانی بایولوژیـا دەریانخسـتووە هـەندێك لــەنێرەکان لــەجیاتی 46 کرۆمۆسۆم هەڵگری 47 کرومۆسۆمن کەسیانیان کرۆمۆسۆمی سێکسین لەدوو چەشــندا دەردەکــەون: یەکــەم لەشــێوەی (xxY) واتــە بـــەزیاد بوونـــی کرۆمۆسـۆمێکی مـێ، ئـەم چەشـنەش بـە کلاینفلـتر Klinefelter نـاسراوە، هەڵگرانی ئەم چەشنە بەدەست کـەموکورتیو لاوازی سێکسیو نەزۆکیـەوە دەناڵێنن وخەسڵەتە سێکسیە ناوەندیەکانیان تیادا دەرناکەوێت وەك ڕیش وسمێڵ ودەنگی گڕو.... تاد ولەچالاکی عەقڵی ودەروونیشدا ناتـەواون. بـەڵام چەشــنی دووەم لەشــێوەی (XYY) دا دەردەکـــەوێت واتـــا بـــەزیادبوونی کرۆمۆســـۆمێکی تـــری نــێر، هــەڵگرانی ئــەم چەشــنە باڵایــان بـــەرزەو شەڕانگێزن (60).

هـەروەها لـەلای هـەندێ نێرینــە 48 کرۆمۆســۆم هەیــە کــەچواریان سێکســین و لەشـــێوەی (XXYY) دا دەردەکـــەون، واتـــا بـــەزیادبوونی دووکرۆمۆسـۆم یـەکێکیان نـێرو ئـەویتر مـێ، ئـەم جـۆرە کەسـانە پێیـان دەوترێت (پیاوی دووئەوەندە) بەشێوەیەکی بەرچاو درێژن ولەهەمان کـاتدا ئاستی زیرەکیان نزمە تاڕادەی دەبەنگی.

لەکۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، زاناکانی تاوان بەشـێوەیەکی کـارا دەستیان دایە توێژینەوە لەسەر کرۆمۆسۆمە سێکسیە زیادەکان بەتایبـەتی لەبەندیخانــەکانی بــەریتانیاو پــەیمانگاکانی بورســتاڵ Borstal دا بەپشــت بەسـتن بەدەرهاویشـتەی توێژینـەوەکانی هـەردوو زانـا پاتریشـیا جـاکوب

Patricia A.Jacobs و ستڕۆنگ J.A. Strong لەبارەی هاوسەنگی کرۆمۆسۆمە سێکسیەکانەوە. توێژینەوەکان زیاتر لەسەر ئەوکەسانە دەکران کەلەچەشنی (XYY) بوون چونکە ژمارەیان لە زیندان و نەخۆشخانە عەقڵیەکاندا (شێتخانە) زۆر بون، بۆیان دەرکەوت ئەوکەسانە ئارەزووی شەڕانگێزییان هەیەو، تێکڕای تەمەنیان لەسەرەتای تاوانکردندا کەمتر بووە لەتێکڕای تەمەنی ئەوتاوانبارانەی لەکرۆمۆسۆمدا سروشتی بوون (واتا لەتەمەنێکی کەمدا تاوانیان ئەنجام داوە)، بەگشتی ناهاوسەنگ وناکامڵ بوون و، هەستیان بەپەشیمانی نەکردووە لەبەرامبەر قوربانیانی تاوانەکانیاندا. ئەوەی زیاتر هانی توێژەرانیدا بۆ درێژەدان بەتوێژینەوەکانیان لەم بارەیەوە لەساڵەکانی شەستەکاندا؛ ڕوودانی چەند تاوانێکی گرنگ بوو لەچەند دەوڵەتێکی جیاوازدا ولەپاشاندا دەرکەوت تاوانبارەکان هەڵگری کرۆمۆسۆمی (XYY) بوون. ئەمەش وای لەچەند زانایەك کرد کەبڵێن: بوونی کرۆمۆسۆمێکی زیادەی (Y) بەشێوەیەکی کاریگەرو نێگەتیفانە کار لەکەسێتی دەکات وبۆ ڕەفتاری تاوانکاری ئامادەی دەکات (61).

خەڵکی لەوساڵانەدا پێیان وابوو وەڵامی یەکجارەکیان بۆ هۆکارەکانی تاوان دۆزیوەتەوە. و یەکێك لەکێشە گەورەکانی مرۆڤایەتی بەرەو چارەسەرکردن دەچێت، ئالێرەوە دەیان توێژینەوە ڕاگیران و زۆربەی زاناکانی تاوان زەمەنێك لەچاودێری وچاوەڕوانیدا دەژیان. بەلاّم هەرزوو ڕاستییەکان دەرکەوتن وبەڵگەکانی خاوەن تیوری کرۆمۆسۆمەسێکسییە زیادەکان لاواز بوون و دەستەوەستان مانەوە. لەدوای هەندێك توێژینەوەی وردو قوڵەوەدەرکەوت:

- ڕادەی شـەڕانگێزی ئـەو تاوانبارانـەی کەهــەڵگری کرۆمۆسـۆمی (XYY) یـن زیـاتر نبیـە لەوتاوانبارانـەی لــەڕووی کرۆمۆسـۆمەوە ئاسـاییو سروشتی بوون.

- ژمارەیەك لەوانــەی هـەڵگری کرۆمۆسـۆمی سیکسی (XYY) یـن لەکۆی گشتی دانیشتوان، لەژیانیاندا هیچ جۆرە تاوانێکیـان ئـەنجام نـەداوەو کەسانی ئاسایین ولەڕووی عەقڵیو ئەندامییەوە سروشتین.

- حاڵـەتی کرۆمۆسـۆمی (XYY) بەرێکـەوت بۆیەکـەمجار لـەلای کەسێکی ئاسایی دۆزرایەوە کەهیچ نیشـانەیەکی نائاسـایی تیابـەدی نـەکراوە ولەڕادەی زیرەکیشدا ئاساییو مـام نـاوەندی بـووە، جگـە لـەوەی نیشانەکانی شەڕانگێزی وئارەزووی تاوانکردنی تیا بەدی نەکراوە.

## تیوری شیکردنەوەی دەروونی:

تۆێژینەوە سایکۆلوژیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست، بەمەبەستی دۆزینەوەی پاڵنەرەکانی ڕەفتاری مرۆڤایەتی،بایەخیان دەدا بەکارلێکی نێوان فاکتەرە بایولوژیو کۆمەڵایەتیەکان، لەسەر پێکهێنانی کەسێتی مرۆڤ و ڕادەی گونجاندن و گەشەکردنی. ئەم هەوڵانە بە ئاقاری شیکردنەوەی دەرووندا دەڕۆشتن و زانای نەمساوی سیگموند فرۆید(1856-1939) بەردی بناغەی تیوری شیکردنەوەی دەروونی داڕشت و زانا هاوکارەکانی وەك جۆزیف برۆیەر(1841-1925)و ئەلفێرد ئەدلەر(1870-1937)و کارل یونگ (1875-1961)زیاتر گەشەیان پێداو دەوڵەمەندیان کرد. لێرەدا ئاماژە بۆ بیرۆکە سەرەکیەکانی تیورەکەی فرۆید دەکەین.

بەلای فرۆیدەوە کۆئەندامی دەروونی لە سێ بەش پێك دێت کە بریتین لە:

### یەکەم: ئەو Id:

لە ڕووی دروست بوون و پێکهاتنەوە کۆنترین بەشەو،ئەو بەشە سروشتیەیە هەڵگری نیشانەغەریزەکانەو لە پێکهاتەی ئەندامی فسیولوجی جیا نابێتەوە و لە ڕێی بۆماوەوە دەگوێزرێتەوە.

ئەو Id سەرجەم پاڵنەرە زگماکیەکان دەگرێتەوە کە فرۆید لە زۆربەی کتێبەکانیدا بەغەریزە ناوی بردوون وەك تینوێتی و برسێتی و هەست کردن بە سەرماو گەرما و خەوتن....تاد بەلام فرۆید زیاتربایەخ بە

دووانییـان دەدات کـەبریتین لـە سـێکس و شـەرانگێزی و پێیوایـە بەشـی گەورەو گرنگن لە بونیـادی کەسێتیدا و نـاوی نـاون غـەریزەی ئـیرۆس(62) یـان غـەریزەی خۆشەویسـتی، سـاناتۆس (63) یـان غـەریزەی وێـران کردنومەرگو شەرانگێزی (64).

ئەوId لایەنی پێکهێنەری سروشتی ئاژەڵیە لەلای تاکەکەس و بـەپێی بنـەمای لـەززەت و چێـژ وەرگرتـن ڕەفتاردەکـات بـۆ تـێرکردنی غەریزەکان و،بەهێزی وزەیەك ئەبزوێ کە فرۆید ناوی ناوە لەبیدۆ.

ئەم لایەنە هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەجیهانی دەرەکـی و واقیعـەوە نییـە، بۆیـە هیـچ شتێك لـەبارەی ئاکارو پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانـەوە نـازانێت، هـەروەها بێئاگایـە لـەکات و شوێن و لێکدانـەوەی لۆژیکی((منداڵـی سـاوا هـاوار دەکات، دەگری،خۆی پیس دەکات هەرکاتێ بیەوێ لە هـەرکوێ بـێ بەهەرشێوەیەك بۆی بلوێت)) بەهـەر شـێوەیەك بێـت پاڵنـەرو پێداویسـتییەکان بـەخێرایی و هەنووکەیی و بـە تـەواوتی و بەهـەر نرخێکە تێردەکات، خۆئەگەر بـۆی نـەکرا ئەوا لەجیهانی ئەندێشە و خەیاڵدا تێریـان دەکات. کەواتـە ئـەو I d وێنەیـەکی سەرەتایی کەسێتییە.

لـەناو ئـەودا هـەردوو غـەریزەی سـێکس و شـەرانگێزی لەمەسـەلەی تـێرکردندا زیـاتر ڕووبـەڕووی سـەختیو دژواری دەبنـەوە و نایەنـە تێرکردن و توشی نائومێدی دەبن.

**دووەم: من** Ego:

ئەم لایەنەی کەسێتی هێدی هێدی و بەشێوەیەکی پلەدار لە ئـەنجامی پەیوەندی منداڵ بە جیهانی دەرەکی واقیعییەوە دروست دەبێـت و بـەهۆی پێنـج ئەندامەکـەی هەسـت کردنـەوە پێـك دێـت. منـداڵ لـە ڕێی

هەستەکانیەوە پێشوازی لە کارتێکەرو وروژێنەرەکان دەکات و ئەزموون وشارەزاییەکان وەردەگرێت و، ئەوشتانە فێردەبێت کە خۆشی بۆ دەهێنن و ،ئەو ڕەفتارانەش فێر دەبێت کە ئازار و ژانیان بە دواوەیە، سەرکەوتن و شکست هێنان، ئارامی وچاوەڕوانیو ئەگەرەکان فێر دەبێت، لێرەوە (خودی عاقڵ) یان من لە تاکەکەسدا پێك دێت (65).

مـن Ego کانگـای هەسـتکردن و پـەی بـردن و حوکمدانـە و خـاوەنی دەسەڵاتی سەرپەرشتی کردنە بەسەر کۆئەندامی جوڵەی ئیرادی دا هەروەها بەسەر هەموو غەریزەکانی ئەو Id دا. لەمرۆڤی عاقڵدا ئەم بەشە بەپێی بنەمای واقیع نەك لەززەت، کاردەکات وئەرکەکەشی گونجاندنە لە نێوان خواستەکانی ئەو I d و باروروەوشی دەرەکیدا، واتا تێر کردنی ئارەزووە غەریزەییەکانە لەکات وبارو ڕەوشی گونجاوی جیهانی دەرەکیدا (66).

من Egoهەڵدەستێت بەخەفەکردن و گۆڕین و بالآپێکردنی غەریزەکان تا ئەو کاتەی هەلومەرجە دەرەکییە واقیعییەکە دەرەخسێت و لە باردەبێت بۆ تێرکردنیان.ئەم بەشە لەمنداڵی بچوکدا لاوازو بێهێزە بۆیە منداڵ پێویستی بەچاودێری و ئاگاداری کردنە، هەروەها لەلای نەخۆشە دەروونیو عەقڵییەکانیش تاڕادەیەکی زۆر لاواز و بێهێزە.

کەواتە من Ego قوربانی بەپێداویستییە هەنوکەییەکان دەدات و ئازارو سوێ دەچێژێ و چاوەڕوانی دەکات بۆ چنگ کەوتنی چێژو لەززەتێکی دواخراو، واتا دەیەوێت بە شێوەیەکی ماقول تێربکرێت نەك بە سادە و ساویلکەیی بۆ ئەوەی زیان بەر تاکەکەس نەکەوێت. دەتوانین بڵێین لەکەسێتی دا من E goڕوخساری هەستی و ئیرادییە (67).

فروید بەم شێوەیە وەسفی من Egoدەکات و دەڵێت: (من)ی گوناه... دەبێت خزمەتکاری سێ سەرداری دەسەڵاتداری توندوتیژ بێت و لەنێوان

داواكارييـەكانى هەرسـێكياندا گونجـاندن و هاوسـەنگى و ڕێكخسـتن دروسـت بكات، ئەوسيانەش بريتين لە: ئەو، واقيعى دەرەكى و منى بالاّ.

**سێيەم: منى بالاّ Super Ego:**

ئـەم بەشـەى كۆئـەندامى دەروونـى مـرۆڤ لـە سـەرەتاكانى تەمەنـەوە لـەڕێى بـەها كۆمەلاّيەتىيـەكان و بنـەما ئاكارييـەكان و داب و نـەريت و چاكـەكردن و دور كەوتنـەوە لـە خراپـەو ڕێنماييـە ئايينييـەكان و ئامۆژگارييەكانى دايك و باوك و پێوەرەكانى كۆمەلگاوە دروست دەبێت.

منـدالّ كـاتێك دەگاتـە تەمـەنى پێنـج و شـەش سالّى ئـەم ئامۆژگـارى و ڕێنماييانە وەك دەسەلاّتێكى ناوەكى لە ناخىدا گەلاّلە دەبێت ولەشێوەى ويژدانـدا جىّى دايـك و بـاوك و سـەرجەم دامـەزراوەكانى تـر دەگرێتـەوە و دەبێتـە ڕەخنـەگرو ئاراسـتەكەر و چـاودێر يـان پاسـەوان بەسـەر پرۆسـە عەقلى يەكاندا.

منـى بـالاّ گـەرچى لـە منداڵىدا پێك دێـت و دەچەسپێت بـەلاّم شـايانى گۆڕيـن و ڕاسـتگردنەوەيە بـە زيـادبوونى ڕۆشـنبيرى تاكەكـەس و ئەزموونـەكانى دەگۆڕێو ڕاست دەبێتـەوە كەواتـە ئەزموونـەكانى سـەرەتاى تەمەن كاريگەرى قولّيان بەسەرقۆناغە جياجياكانى تەمەنـەوە دەمێنێتـەوە (68). فرۆيـد پـىّ وايـە منـى بـالاّ لـەدوو لايـەن پێـك دێـت كـە ئـەوانيش بريتين لە:

1-منـى نموونـەيى يـان منـى ئايديـايى كـە هـەندىّ جـار پـىّ دەوترێـت ئـەرك (الواجـب) بـاوك ودايـك و مامۆسـتايان بەشـێوەيەكى مەبەسـتدار ناوەڕۆكى منى ئايديايى لەناخى مندالّدا دەچێنن وئاراستەى دەكەن بۆ كارى پەسەندو ويستراو بۆئەوەى مندالّ بكـەن بـە(پيـاوى بچوك) بـۆ هـەركارێكى

باش‌و ڕێك‌و پێك كەبیكات، ئافەرین و ستایشی دەكەن ، لەلایەكی تریشەوە ڕەنگە لەڕێی لاسایی كردنەوە و شوێن پێ هەڵگرتنەوە منی نموونەی پێك بێت .

2-ویـژدان: وەك ئاماژەمـان بۆكـرد هـەندێك جـار بـە منـی ئایدیـایی دەوترێت ئـەرك و ویـژدان وەك ((پێویستە، دەبێت)) باسی لێوە دەكرێت بوونی ویژدان لە كەسێكدا دەتوانرێت بـە ئاسانی بسەلمێنرێت لـە كاتێكدا كارێك بكات و لەگەڵ پێوەرەكانی خۆیـدا نـەگونجێت و یەكنەگرێتـەوە وەلـە ئەنجامدا كەسەكە هەست بەگوناهو ئەشكەنجەی دەروونی بكات و بـە خـۆی بڵێت (نەئەبوایە یان ئەبوایە ئەوەم بكردایە یان نەكردایە). كەواتە ویـژدان بەو مانایە دێت تاكەكەس بتوانێت خۆی خودی خۆی سزا بدات (69).

فرۆید لـە نیشانەكانی كـامڵ بوونـی كەسێتیدا دەڵێت: مـەرج نییـە تاكەكەس هەربە تەنها بۆ گەیشتن بەو(منە ئایدیایییە) تێبكۆشێت كـە بـۆ خـۆی پێكـی هێنـاوە بـەڵكو دەبێت تواناشـی هـەبێت بـۆ حوكـم دان بەسـەر خودی خۆیدا واتا دەبێت ویژدانی ناوەكی هەبێت.

دەكرێت لـەم چـەند خاڵـە دا پوختـەی منـی بـاڵا كـورت بكەینـەوە و بیخەینە ڕوو:

- لەڕووی پێكهاتنەوە: سەرجەم بەهاو پێوەرو بیروباوەڕو بنـەما ئاكارییـەكان دەگرێتـەوە كـە تاكەكـەس بـۆ حوكمـدان بەسـەر پاڵنـەرو ڕەفتارەكانیدا بـەكاریان دەهێنێت و بیركردنـەوە و كردەوەكـانی ڕێنمـایی دەكەن

- لەڕووی ئەركەوە ئەو لایەنەی كەسێتی دەگرێتەوە كە: ئاراستە دەكات و ڕخنە دەگرێ و سزادەدات، واتا لەیەك كاتدا هەرسێ دەسـەڵاتەكەیە (یاسادانان و قەزائی و جێ بەجێ كردن).

• لـەڕووی هـێزی بزوێنـەرەوە دەکرێـت بڵێـین: ئامادەباشـی لاشعورییانەی پاڵنەرەکانـە وەك ڕێگـرو لەمپـەری وەرگیراو لەسـەر بنـەمای ترس و خۆشەویستی و ڕێزگرتن (70).

کێشـەکە لـەدیاری کردنـی هەڵوێستی تاکەکەسـدایە لـەنێوان ئـەم سـێ هێزەدا: هێزی ئەو I d وهێزی منی باڵاو هـێزی واقیـع، هەریەکـە لـە (ئـەو) و(منیباڵا) داواکاری خۆیان هەیە و پێویستە من E go بـەپێی بنـەمای واقـع ڕازییان بکات وهاوسەنگی بپارێزێ و هەستی گوناهباری نەخولقێنێت.

ئەگـەر هـاتوو مـن Ego توانـی لـە کارەکـەیدا سـەرکەوتووبێت و بـە شێوەیەکی کامڵ گونجاندن دەستەبەر بکات ئـەوا ژیـانی دەروونـی کەسـەکە ئاسـایی دەبێـت و کەسـێتیش کـامل وهاوسـەنگ دەبێـت. خۆئەگـەر بـەهۆی فشاری زۆری ئەو ومنی باڵاوە شکستی هێناو لاوازی من Egoدەرکـەوت، لـەم حاڵەتەدا هاوسەنگی تێك دەچێت ،بۆیە بەناچاری کۆئەندامی کەسێتی پـەنا دەباتە بەر میکانیزمی فێڵە بەرگرییەکان بۆگەڕانـەوەی ئـەو هاوسـەنگییە، ئەگـەر میکـانیزمی فێڵـە بەرگرییـەکانیش شکسـتیان هێنـا ئـەو کاتـە ناهاوسـەنگییەکە لەشـێوەی نەخۆشـی دەروونـی و عـەقڵی یـان ڕەفتـاری تاوانکاری دا دەردەکەوێت.

## میکانیزمی فێڵە بەرگرییەکان:

ئەم فێڵە بەرگرییانە هەوڵدانی ناڕاستەوخۆن بۆ هێنانەدی گونجاندن و هاوسەنگی دەروونی ، و دەکرێت بەم شیوەیە پیناسـەیان بکـەین: کۆمـەڵێك کەرەسـەو شـێوازی لاشعورین و لەلایـەن تاکەکەسـەوە بـەکاردێن و،ئـەرکیان شـێواندن و سـڕینەوەی حەقیقەتـە بـەئامانجی ڕزگـارکردنی کەسـەکە لـە حاڵەتەکانی نائارامی و دڵەڕاوکێ، کە بەرئەنجامی ئەو ململانێ و شکستانەن

هەرەشە لە ئاسایشی دەروونی مرۆڤ دەکەن و دەخـوازن تاکەکەس بپاریزن و داکۆکی لیٚ بکەن تاکو زیاتر بڕوای بە خۆی هەبێت و ڕێز لە خـودی خۆی بگرێت و ئاسودەیی سایکۆلوژی بـەدی بهێنێت. کەواتـە خـودی مـرۆڤ فێڵـە بەرگرییـەکان وەك چەکـەکانی بـەرگریکردن لـە دەروون بـەکاردەهێنێت دژ بە شکست و نائارامی و دڵەراوکیٚو، ئەرکی ڕاستەقینەیان پاراستنی منەEgo لـەو هەڕەشـانەی ئاراسـتەی دەکرێت لەلایـەن لاشعورو منـی بـاڵاو جیـهانی دەرەکییەوە.

هەموو کەسێك ئەم فێڵە بەرگرییانە بەکاردەهێنێت (کەسـانی ئاسـایی و نائاساییو ساغ و نەخۆش) بەڵام جیاوازییەکەیان لەوە دایـە مرۆڤـی ئاسـایی و ساغ سـەرکەوتوو دەبێت و ،نائاسـایی و نەخۆشـیش بەبـەردەوامی شکست دەهێنیٚ. یەکەمیان بەشێوەیەکی مام ناوەند بەکاریان دەهێنێت و دووەمیـان زیـادڕەوی دەکـات لـە بـەکارهێنانیاندا، هـەر شـتێکیش لـەڕادەی خـۆی زیـاتر بووبۆ دژەکەی هەڵدەگەڕێتەوە. لێرەدا بەمەبەستی ڕوون کردنەوەی زیاتری فێڵە بەرگرییەکان هەندێکیان دەخەینە ڕوو:

. شەرانگێزی: بریتییە لەو هێرشەی تاکەکەس دەیکاتە سەر کەسێك یان هەرشـتێکی تـر وەك ئـەوەی ئـەو کەسـەیان ئـەو شـتە لێپرسـراوبێت لـە دروست کردنی ئەو لەمپەر وڕیگرانەی کەنایەڵێت کەسەکە بەئامانجی خۆی بگات وەك: جنێودان و سوکایەتی پێکـردن و ترسـاندن و نوکتـەی سـووك و سەرزەنشت کردن

. بـاڵاپێکردن: بریتییـە لـە بەرزکردنـەوەی ئـەو پاڵنەرانـەی کـە کۆمـەڵگا قبوڵیـان ناکـات بـۆ ئاسـتێکی بـەرز و بـاڵاو گوزارشـت لێکردنیـان بەکەرەسـەی پەسـەند لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە بۆنموونـە بـاڵا پێکردنـی

پاڵنەری سێکسی بۆ نوسینی شیعری دڵداریو،پاڵنەری شەرانگێزی بـۆوەرزش (بۆکسێن).

. پێوەلکاندن: بریتی‌یە لەپێوەلکاندنی ئەو خەسڵەت و سیفاتانەی لە خودی کەسێکدا هەیە و نابەجێن، بەکەسانی‌ترەوە،پێوەلکاندن زیاتر لەوەی تاوانبارکردنی کەسانی تربێت،دان پیادانـانێکی لاشعوری‌یە بـەو خەسـڵەت و سـیفاتە نابەجێیانـەدا.وەك وەسـف کردنـی خـەڵکی بـەناپاکی‌وداوێن پیسی‌و خۆپەرستی و درۆکردن و کەمتەرخەمی.

. نێگەتیفایـــەتی: بریتی‌یـــە لـــە بـــەرگری‌کردن لـــەو فشـــارو لێپرسراوێتی‌یەی کەلـە ئەسـتۆی تاکەکەسـدایەو داوای‌لێدەکرێت بـەڵام ئـەم پێچەوانەکەیان دەکات وەك حاڵەتەکانی بێدەنگی ویاخی بوون و ڕەفزکـردن و نکوڵی کردن.

. گۆڕین:بریتی‌یە لەوەرگرتنی بـەدیل بـۆ پاڵنـەرێك کـەتێر نـەکرێت یان ڕەفتارێکی نابەجێ لەڕووی کۆمەڵایەتی‌یەوە، بەدیلەکە هـەردەم لەشـتە ڕاستەقینەکە دەچێت،وەك گۆڕینی ڕەفتـاری شـەرانگێزی لەباوکـەوە بۆبـرای بچوك یان کەرەسەکانی یاری‌کردن.

6-پەرچەپێکهاتن: بریتی‌یە لە گوزارشت کردنە لە پاڵنەرێکی ناشـیرین و نەشیاو،بەئاراستەیەکی پێچەوانە وەك : ئایینداری وەك پەرچـەکردارێك بـۆ بێبـاوەڕی ، زیـادڕەوی لـە خۆپێچانـەوە وەك پەرچـەکردارێك بۆپاڵنـەری سێکسی بـەهێز، هـێرش کردنـــە سـەر ژنــانی سـفور وەك پەرچـەکردارێك بۆحەزکردن لە سفورایەتی و زیـادەڕەوی لـە پێکـەنین وەك پەرچـەکردارێك بۆ کارەسات و لێقەومانێکی گەورە.

7-خەفەکردن : بریتی‌یە لە دورخستنەوەو چەپاندنی هزروبـیری پـڕ لـە ژان و ئـازاراوی و نابــەجێ کـە سـەرچاوەی دڵـەراوکێن، لـە گۆڕەپـانی

هەستەوە بۆگۆڕەپانی نەست(لاشعور)، تاکەکەسەکە خۆی بە دوربگرێت لە گوناهو ئەشکەنجەی خودوویژدان وەك خەفەکردنی غیرە یان ڕق و کینە.

ئەمانە و چەندین فێڵی بەرگری تر وەك : لە بەر یەکترازان و ئەندیشەکاری و، پاساو هێنانەوە وخەفەکردن و گشتاندن و.....تاد. ئەتوانین بڵێین ئەم فێڵە بەرگرییانە ئەوەندەی مەبەستیانە تاکەکەس لە نائارامی و دڵە ڕاوکێ ڕزگاربکەن ئەوەندە مەبەستیان چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانەکان نییە (71)، (72)، (73).

## ڕاڤەکردنی ڕەفتاری تاوانکاری لە تیوری شیکردنەوەی دەروونیدا:

لە ئەنجامی ئەو ناکۆکی و مل ملانێیانەی لە قۆناغی منداڵی بەرایی دا هەیە لە نێوان ئەوI Id و من Egoو منی باڵا دا ، منداڵ هەوڵدەدات بۆ خەفەکردنی ئەو غەریزانەی کە ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە و تێریان بکات،هەروەها خەفەکردنی ئەو هەڵچوون و هزرویدەوەری و خورپەو شۆکە شعوریانەی کە پڕ ئازار و ژان و شاراوە و شەرماوین لە ژیانیدا. پرۆسەی خەفەکردن نابێتە هۆی سڕینەوەی یەکجارییان، بەڵکو لە گورەپانی هەستەوە دەیانگوێزێتەوە بۆ گۆڕەپانی نەست و لەوێدا عەمباریان دەکات و بەشاراوەیی دەمێننەوە یاخود دەکەونە حاڵەتی مل ملانێ ی ناوەکی هەست پێ نەکراوەوە و بەچەندین شێوە لەهەستدا ڕەنگدەدەنەوە وەك دڵەڕاوکێو دڵتەنگی و نائارامی،یان لە شێوەی هێماو سومبول لە خەوندا دەردەکەونەوە یان لە هەڵەی زمان و نووسین و ڕەفتاری بێ بناغەو هەڵەشەدا دەردەکەون، ئەو ململانێیانەی کەهەیە دەکرێت لەم هاوکێشانەدا ڕوونیان بکەینەوە:

- ئەو دژی من
- منی باڵا دژی من
- ئەو + من : دژی منی باڵا
- منی باڵا + من : دژی ئەو (74)

مل ملانێ دەروونییەکان لە نەستدا بەردەوامن ولو دەروونی منداڵدا چەندین گرێی دەروونی دەخولقێنن وەك گرێکانی ئۆدیب و ئەلێکتراو غیرە و گوناهو هەست کردن بەکەمی و مەحارم وقابیل.....تاد. لە نێو ئەو گرێیانەدا فرۆید بایەخێکی گەورەی بە هەردوو گرێی ئودیب (75) و ئەلێکترا (76) داوە و، جەختی تەواویان لە سەر دەکاتەوە.

بەلای فرۆیدەوە منداڵی کوڕ لە سەرەتادا دایك و باوکی خۆی وەکویەك خۆشدەوێت و جیاوازییان لە نێواندا ناکات، بەڵام لە ساڵانی سێیەم و چوارەمی تەمەنیدا زیاتر هۆگری دایکی دەبێت و خۆشی دەوێت ئەمەش گوزارشە لەو ئارەزوو سێکسییە زگماکییەی کە هەیەتی.ئینجا بەهۆی پەیوەندی سێکسی باوکی لەگەڵ دایکیدا، غیرە لە دەروونی منداڵەکەدا دروست دەبێت و باوکی دەبوغزێنێ و خۆشی ناوێت ولێی دەترسێت. لێرەوە هەست کردن بەکەمی لە بەرامبەر باوکیدا (کەبەهێزو مەزنە) لە لادروست دەبێت. لەم کاتەدا من Ego و منی باڵا دێنە ئاراوە و ئەوهەست ونەستە نابەجێیەی ئەو رەفز دەکەنەوە. ئیدی پرۆسەی خەفەکردنی ئەو هەست و نەستە نابەجێیانە بۆ گۆڕەپانی نەست دەست پێدەکات. ئینجا لەئەنجامی ئەم مل ملانێ بەردەوامەدا گرێی ئۆدیب لەلای کوڕەکە دروست دەبێت (77).

کاتێك منداڵ بەشێوەیەکی دروست و پەسەند پەروەردەبکرێ و توشی دابڕان (بەهەموو جۆرەکانییەوە) نەبێت و توندوتیژی لەگەڵدا بەکارنەیەت

(واتا گرێی خەساندن) (78) ئەوا منداڵ بەبێ‌کێشەو گرفتی گرێی ئۆدیب تێدەپەڕێنێ‌و ئەوینەکەی بۆدایکی دەبێت بەهۆگری ئاسایی، وغیرەکەی بۆباوکی دەبێت بەسەرسام بوون و خۆشەویستی‌و لاسایی کردنەوە و وەرگرتنی کەسێتی باوکی.بەپێچەوانەوە ئەگەر منداڵ سەرکوت بکریت و لێیبدرێت و توشی دابران ببێت یاخود بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر نازی پێبدرێت وسەرجەم حەزو ئارەزوەکانی تێربکرێن، یاخود پەروەردەیەکی ناجێگیر (دەمێك لێبوردن وبێ‌دەنگی و دەمێکی تر سزادان و توڕەبوون لەسەر هەمان ڕەفتار) پەروەردەبکرێت، ئەوا ناتوانێت بەسەر ئەو گرێیەدا زاڵ ببێت وچەندین لادانی دەروونی توش دەبێت وەك: وابەستەبوونی بێئەندازە بەدایکەوە وغیرەیەکی مەزن بەرامبەر باوك یان مێردی دایکی‌و، کەم توانایی سێکسی و،بێ ڕەوشتی (لواطیة) ودژایەتی کردنی باوك وهەموو سەرکردەیەکی‌تر یان هەموو دەسەڵاتدارێك، لەحاڵەتە توندوتیژەکاندا ڕەنگە باوکی‌خۆی بکوژێت وپەلاماری سێکسیانەی دایکی بدات، بەلاَم ئەم حاڵەتە دەگمەنەو کەمتر ڕوودەدات بۆیە ڕق وکینەکە لەشێوەی هێماو ڕەمزدا دروست دەبێت وەك دزینی پارەی باوك یان ساختەکردنی (چەك)ی دارایی لەبانکدا یان سوتاندنی ماڵ‌و کەرەسەکانی باوك (79).

لە هەموو حاڵەتەکاندا تاوان لەڕوانگەی ئەم تیورەوە بریتی‌یە لە گوزارشتکردنێکی ڕاستەوخۆ لەپاڵنەرە غەریزەیی‌یەکان وداواکارییەکانی ئەو Id‌یاخود گوزارشتکردنێکی ڕەمزی‌یە لەپاڵنەرە خەفەکراوەکانی ناولاشعور لەهەردوبارەکادا منێکی Ego لاواز هەیەو ناتوانێت هاوسەنگی لەنێوان هێزە بەیەکدا چووەکاندا بکات واتە لەنێوان ئەو، منی باڵا، واقیع.

زانای فەرەنسی (دانیال لاگاش) بەپشت بەستن بەم تیورە لەشێوازێکی نوێدا ڕەفتاری تاوانکاری لێکداوەتەوە وگەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە کەسێتی تاوانبار ئەم سێ ڕواڵەتەی هەیە:

. بەشێوی لەپرۆسەی گەشەپێکردنی کۆمەڵایەتی دا بەهۆی پەروەردەکردنی هەڵەو چەواشەو نادروستەوە.

. پەشێوی وهەڵە بەکۆمەڵایەتیکردنی مرۆڤدا، یان پەشێوی لەتێکەڵ کردن و هێنانە نێو کۆمەڵگای تاکەکەسەوە، بەهۆی چڕکردنەوەو جەخت کردن لەسەر خود گەرایی یان وابەستەبوون بەهەڵوێستی منداڵانەوە، یان ڕاڤەکردنی هەموو شتێك لەدیدگای تەسکی خودگەرایی یەوە وگرنگیدان بەبەرژەوەندی شەخسی وگوێنەدان بەبەرژەوەندی کەسانی تر ولەدەستدانی هەستی بەرپرسیارێتی ولێپرسینەوە.

. پێنەگەین و کامڵ نەبوون، بەواتا بێدەسەڵاتی لەدواخستنی تێر کردنی پاڵنەرە غەریزیەکاندا (هەنووکەیی بۆئایندە) بێ توانایی لەحوکمدان ورەخنە لە خۆگرتن و، پەندو ئەزموون وەرنەگرتن **(80)**.

## هەڵسەنگاندنی تیورەکەی فرۆید لە تاواندا

لەهەڵسەنگاندنی ئەم تیورە لەبواری تاواندا ئەکرێت ئەم خاڵانە بخەینە ڕوو:

- هەندێك لە دەستەواژەو چەمکەکانی تیورەکە ئاڵۆزو تەماوین و، بەکارهێنانی تیورەکەی واڵێکردووە کارێکی قورس ودژوار بێت وتەنها دەستە بژێرێك لەزاناکان پێیان ئەنجام بدرێت **(81)**.

- تیورەکە جەخت لەسەر لایەنی غەریزەیی وزگماکی دەکاتەوە لەڕەفتاری لادەرانەو تاوانکاریداو، دەستەوەستانی من Ego لەبەرامبەریاندا پیشان دەدات، ئەمەش بۆخۆی گەڕانەوەیە بۆ حەتمیەتی بایولۆژی تاوانبارو

تاوانکردن وکەمکردنەوەی ئەگەرەکانی چارەسەرکردن، چونکە چاکبوونەوە کاتی‌یە لەبەر بوونی بەردەوامی پاڵنەرە زکماکیەکان و، لەهەر ساتەوەختێکدا من Ego لاواز ببێ ئەوا پاڵنەرەکان زاڵ دەبن ودەسەلاَت دەگرنەوە دەست بەسەر کەسەکەدا. ئەمانەو جگە لەبایەخدانی کەمی تیورەکە بە لایەنی کۆمەلاَیەتی وژینگەی دەوروبەر.

- تیورەکە شوێن وپلەو پایەیەکی مەزنی داوە بەپاڵنەری سێکس لە سەرجەم هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤدا، ئەم بۆچوونەش هەتا ئەمرۆ نەتوانراوە ڕاستیو دروستی بسەلمێنرێت.

- زۆرێك لەزاناکانی شیکردنەوەی دەروونی لادانیان بەنەخۆشی دەروونی‌یەوە بەستۆتەوە و، تاوان بەجۆرێك لەنەخۆشی دەروونی وەسف دەکەن. ئەمەش خۆی لەخۆیدا زیادڕەوی‌یە چونکە مەرج نیە هەموو تاوانبارێك بەزەرورەت نەخۆشی دەروونی هەبێت یان هەموو نەخۆشێکی دەروونی تاوانبار بێت وتاوان ئەنجام بدات.

- ڕێگای چارەسەرکردنی کێشەی ڕەفتاری تاوانکاری بە شی‌کردنەوەی دەروونی بەگەڕانەوە بۆ هۆکارەکانی تاوانکردن دەکرێت لەنێو لاشعوردا، ئەم کارەش پرۆسەیەکی یەکجار قورس و ئاڵۆزەو پێویست بەوە دەکات بگەڕێینەوە بۆقۆناغی منداڵی، لایەنەکانی ئەم قۆناغەی تەمەنیش بەلای نەخۆشەکەو کەسوکاریەوە نادیارو شاراوەیە وزەحمەتە تیشکی تەواوەتی بخرێتە سەر وکاتێکی زۆری دەوێت ولەساڵێکەوە بۆ پێنج ساڵ درێژە دەکێشێت وڕەنگە لەهەندێ حاڵەتدا دە ساڵیش بخایەنێت، لێرەدا وای لێدێت دەرگای دامەزراوە سزایی‌یەکان دابخرێت وبگۆڕدرێت بۆ کلینکی دەروونی و، چارەسەر بۆ هەموو تاوانبارەکان بدۆزنەوە وبکرێت، ئەمەش ئاستەمومەحاڵە (82).

## قوتابخانەی کۆمەڵایەتی لەتاواندا

بـــــەلای زاناکـــــانی کۆمەڵناســـــییەوە تــــاوانکردن یەکێکـــــە لەدیاردەکۆمەڵایەتی‌یـەکان و دوورە لەمەسـەلەی تاکایـەتی مرۆڤـەوە (واتـا بەهەست و نەست ورەفتاری تاکە کەسـانەوە نـەلکاوە، دیـاردەی کۆمەڵایـەتی لـە کۆمەڵناسـیدا مـەرج نییـە بـەزەرورەت لەحاڵەتـە تاکایەتی‌یـەکاندا کـامڵ ببێـت واتـا دەشـێت بوونـی هـەبێت بەبێ‌ئـەوەی تاکەکەسـان بـەکردەوە پراکتـیزەی بکـەن و بەبێ‌ئـەوەی لـە هەسـت و نەسـت ورەفتارەکانیـاندا ڕەنگدانـەوەی هـەبێت) بۆیـە لەچوارچێوەیـەکی بابـەتی و بـەپێی میتـۆد لێکۆڵینەوەیان بـۆ کـردووە. ڕەفتـاری تاوانکاری بـەلای ئەوانـەوە ڕەفتـارێکی مرۆڤایەتی‌یـە و لـەنێو گروپێـك لـە خـەڵکیدا دێتـە کـردن وبەتـەواوەتی پەیوەسـتە پێیانـەوە. ئینجـا بۆئـەوەی لـەم ڕەفتـارە تێبگـەین پێویسـتە حەقیقەتـە کۆمەڵایەتی‌یـەکان کەپەیوەسـتن بـەرەفتارەوە توێژینـەوەیان بـۆ بکرێـت، واتـا بـۆ پرۆسـە کۆمەڵایەتی‌یـەکان وبوونیـادی کۆمـەڵگاو گۆڕانـی کۆمـەڵ وکارێکـە کۆمەڵایەتی‌یـەکان. بەمانایـەکی‌تر دەبێـت توێژینـەوە بـۆ مۆرکـی کۆمەڵایـەتی تـاوان بکرێـت وئـەو پرۆسـەو گۆڕانـە کۆمەڵایەتیانـە بەهـەند وەربگـیرێن کەبەهۆیانـەوە ورەفتـاری تاوانکـاری سـەرهەڵدەداتو بەرجەستە دەبێت.

بـەهۆی کاریگـەری کۆمەڵناسی‌یەوە لەهـەردوو سـەدەی نـۆزدەو بیسـتدا، فراوانترین وقوڵـترین توێژینـەوە بـۆ ڕەفتـاری تاوانکـاری کـراوە کـە هـەرگیز مێژووی ئەو ڕەفتـارە بەخۆیـەوە نـەی‌دیووە. ئـەو توێژینەوانـە بـەئاقارێکدا ڕۆشـتوون کـەئامانجیان دۆزینـەوەی یاسـاکانی نێـوان تـاوان و ڕەگـەزەکانی

ژینگـەی کۆمەڵایـەتی بـووە وەك بــارو ڕەوشــەکانی ئــابوریو سیاســی و ئیکۆلۆژی وپێکهاتەی ئایین و خێزان و بەدڕەوشتی وکۆچکـردن و جـەنگ و کودەتـاو شۆڕشـەکان. هـەموو ئـەم توێژینەوانــە دەکرێـت بـە قوتابخانــەی کۆمەڵایـەتی لــەتاواندا ناوزەدیــان بکــەین کەلــەم هاوکێشــەدا دیــاردەی تاوانیان داڕشتووە:-

تاوانبــار دیاردەیــەکی تاکایـەتی دورە پـەرێز نیــە، بــەلکو بەرهــەمی کۆمەلگاکەیەتی بـەو وەسفەی ئەندامێکە لـەنێو گروپـەکیدا و تاوانەکەشـی کردەوەیەکـە دژ بەیاساکانی ئـەو گروپـە، یـان کردەوەیــەکی دژ بەکۆمەڵـە. ئینجـا بـۆ ناسـینی ئـەو فاکتەرانـەی وا لـە تاوانبـار دەکــەن بـەو کردەوەیـە هەڵبستێت، پێویستە پەیوەندیەکانی نێوان ئــەوو ژینگـە کۆمەڵایەتییەکـەی توێژینــەوەیان بـۆ بکرێـت وپاشــان لـەڕێی ئــەو پەیوەندیانــەوە ڕەفتــارە تاوانکارییەکەی شیکاری بۆ بکرێت.

پێویستە بگوترێت لەنێو ئەوزانستانەدا کەکاریگـەری تـەواویان کردۆتـە سەر ڕەوتی کۆمەڵایەتی لە لێکدانەوەی تاواندا: سـایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتییـە (83)، ئەم زانستە پێی وایە تیوری تاوانکردن دەبێـت دوو مەسـەلەی گرنـگ لەبەرچاو بگرێت کەئەمانەن:-

1-دیاردەی تاوانکردن لەزەمان وشـوێنێکدا ڕوودەدات وئـەو هۆیانـە چـین کەسازی دەدەن و دەیهێننە بوون و بەچ شێوەیەك کـار دەکەنـە سـەر دیـاردە کۆمەڵایەتییە هەمە جۆرەکانیتر؟

2-ئـەو فاکتـەرانـە چـین کـەپاڵ بەتاکەکەســەوە دەنێــن تــاوان بکـات لــە باروڕەشـێکدا کەکەسـانی تریـش تیـایدا دەژیـن بـەبێ ئـەوەی تــاوان ئــەنجام بدەن، بەواتایەکی تر ئەو هۆیانە لێکبدرێنەوە کە جیاوازی لەوەڵامدانـەوەی

تاكەكەساندا دروست دەكەن بۆ كارتێكـەرە كۆمەڵايەتيـەكان لەيـەك ژينگـەی كۆمەڵايەتی هاوبەشدا.

لـەم سـەرو بـەندەی قوتابخانـەی كۆمەڵايـەتی‌دا چـەندين تيـور سـەريان هەڵداوە ولێرە بەدواوە ئاماژە بەهەندێكيان دەدەين:-

## تيۆری ئابوری

لـــەمێژە بـــارو ڕەوشـــی ئـــابوری كۆمـــەڵ وەك يـــەكێك لـــەديارده كۆمەڵايەتيـــەكان، لـــەنێو ئـــەو توێژينەوانـــەدا بايـــەخی پێـــدراوە كـــەبۆ چارەســـەركردنی كێشـــەی تـــاوان ئـــەنجام دراون. بيريـــارانی كـــۆن ونـــوێ (فەيلەســـوفەكانی يونـــان وڕۆمـــانی كـــۆن، فەيلەســـوفە ئيســـلامييەكان لەســـەدەكانی نـــاوەندا، فەيلەســـوف وبيريـــارە ئەوروپی‌يـــەكان لەســـەردەمی ڕێنيسانس ونوێدا) لەسەر ئـەم مەسـەلەيە ڕاوبۆچوونـی خۆيـان دەربڕيـوەو لێكيـان داوەتـەوە، كـاتێكيش زانســـتە مرۆڤايەتی‌يـەكان بـەقۆناغی زانسـتی گەيشـــتن، ئيـــدی توێژينـــەوەكان بۆدۆزينـــەوەی پـــەيوەندی ماددييانـــەی ڕاسـتەوخۆ بـەديارده كۆمەڵايەتی‌يەكانـەوە هاتنـەكردن وچـەندين ئامـار بـۆ ئەوكێشەيە كران.

سـەرەتای توێژينـەوە ئامارييـەكان بـۆ دەرخسـتنی كاريگـەری بارورەوشـی ئابوری لەسەرتاوان دەگەڕێتەوە بۆ زانای بـەلجيكی ئـەدۆڵف كۆتلێـت (1796-1874)و زانای فەرەنسی ئەندريە ميشێل گيوری (1802-1866) ئەو دوو زانايە لەتوێژينەوەكانياندا گەيشتنە ئـەو بـاوەڕەی كـەبڵێن: فاكتـەرە ئابوری‌يـەكان ڕۆڵێكـی ديـاروبـەرچاويان هەيـە لـەڕوودانی ديـاردەی تـاواندا ئـەمانيش بەهەماهـەنگی لەگـەڵ بەشـداريكردنی فاكتـەرەكانی تـری وەك كەشـوهەواو

تەمەن و ڕەگەزو خێزان وئایین و ڕۆشنبیری، ئەو دیاردەیە دەخولقێنن (84).

لەو کاتە بەدواوە دەیان توێژینەوەی لەوجۆرانە ئەنجامدراون بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی تاوانکردن، لێرەدا ئاماژە بۆ دووبابەتی سەرەکی دەکەین کەزۆربەی توێژینەوەکان جەختیان لەسەر کردۆتەوە:

1-**هەژاری**:

پەیوەندی هەژاری بەتاوانەوە مەسەلەیەکی کۆنەو ئەفلاتون و ئەرستۆش لەو بارەیەوە ڕاوبۆچوونیان دەربڕیوە و هەتا ئەمڕۆ جێی بایەخ وگرنگی پێدانی شارەزایانە. بەلای ئەفلاتون وئەرستۆوە هەژاری بارێکی هەڵچوونی نزم لەلای تاکەکەس دروست دەکات کەبەرئەنجامی هەستکردنە بەنەبوونی دادپەروەری، ئەم ڕەوشەش پاڵ بەکەسەکەوە دەنێت بۆ خراپەکاری بەهەموو شێوەکانیەوە کەتاوانکردن یەکێکە لەو شێوانە.

قەشە تۆمائەکوینی (1225- 1274) و تۆماس مۆر (1478- 1535) هەمان ڕایان هەیەو هەژاری بە فاکتەری سەرەکی دادەنێن لەڕەفتاری تاوانکاریدا وپێیان وایە زۆربەی تاوانەکان بەتایبەتی دزی کردن پاڵنەری پێداویستی ماددی لەپشتەوەیە.

زۆرێك لەزاناکانی سەدەی نۆزدە لەبەلجیکاو فەرەنساو ئەڵمانیاو ئینگلتەرەو ئوستراليا لەو بڕوایەدان پەیوەندی بەهێز لەنێوان هەژاریو تاوانکاریدا هەیەو، توێژینەوەکان بۆتاوانەکانی: دزی وناپاکی لەئەمانەت و سوتاندن وداوێن پیسی وکوشتنی منداڵ ولێدان ویاخیبوون کوشتنو بەکارهێنانی توندوتیژی دژ بەدەسەڵاتی گشتی ودەستدرێژی بۆ سەر کارگێڕی گشتی وئایین وتاوانی سێکسی....تاد بەوە کۆتاییان هاتووە

کـەدەڵێن: هـەژاری ژینگەیـەکی لـەبارو بەپیتـە وزەمینـە خۆشـکەرە بـۆ ئەنجامدانی تاوان (85).

لـەم بارەیـەوە چـەندین توێژینـەوە لـە ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا ئەنجامدراوە بۆنموونە بۆل لوینت ساڵی 1941 لە توێژینەوەیەکدا ئاماری بۆ بـەندکراوەکانی شاری (یـانکی سـیتی) کـردووە لـەماوەی حـەوت سـاڵدا و، دەڵێت: لەکۆی ئەو بەندکراوانە (90٪) یان سەر بەچینە هەژارو نزمەکانو لەناوچە هەژارنشینەکاندا ژیانیان بەسەر بردووە.

سەبارەت بەو توێژینەوانەی لەسەر هەژاری کراون، چـەندین ڕەخنـەیان ئاراستە کراوە وەك:

1-ژنـە توێـژەری ئینگلیزی (مـاری کاربنتـەر) لەسـاڵی 1853 دا دەڵێـت: کاریگـەری هـەژاری وناهـەمواری ئـابوری لــەهاندانی مــێردمنداڵاندا بـۆ تـاوانکردن زۆر کـەمترە لـە کاریگـەری پێکهاتـەی ڕۆشـنبیری بـاوك ودایـك و، ئەمەی دووەمیان فاکتەری ڕاستەقینەی تاوانکردنە نەك هەژاری.

2-دوو توێـژەری ئـەمریکی (ولیـام هیلـی و ئۆگەسـت برۆنـەر) لەسـاڵی 1926دا لـەم بارەیـەوە توێژینەوەیـەکیان لەسـەر (657) مـێردمنداڵی تاوانبـار ئــەنجام داوەو گەشــتوونەتە ئــەو ئاکامـــەی کــەڕێژەی 27٪ یــان لــەڕووی ئابووریــەوە هــەژاربوون وئەوانــەی تـــر بـــاری ئابورییـــان ئاســـایی بـــووە وهەندێکیشیان زۆر دەوڵەمەند بوون.

3-لە هەندێ وڵاتی وەك حەبەشـەو هندسـتان و وڵاتـانی تـری ئـەفریقادا کەڕۆژانـە هـەزاران کـەس لەبرسا دەمـرن کـەچی هێشـتا تـاوانی دزیکـردن کەمترە لە وڵاتـە دەوڵەمـەندەکانی وەك ئەمـەریکا ووڵاتـانی ئـەوروپا ئەگـەر هەموو ڕەهەندەکان بەشێوەیەکی زانستی لەبەرچاو بگیرێن (86).

2- **ناجێگیری ئابوری**:

هـەروەك چـــۆن هـــەژاری وەك ڕەهـــەندێکی ئـــابوری وهۆکـــارێك بـــۆ تاوانکردن، سەرنجی توێژەرانی ڕاکێشاوە بەهـەمان شـێوە گرنگییـان داوە بـە شـلۆقی وپەشـێوی ئـابوری وشـوێنەوارە ترسـناکەکانی بەتایبـەتی لەحاڵەتـــە سەخت ودژوارەکانیدا،. ئەو ڕەوشە سـەخت ودژوارانـەی کەهـەژاران دەخاتـە لێـواری برسـێتی ومەرگـەوە و،چینـە مـام ناوەندیـیـەکانیش دەخاتـــە ڕیـــزی هەژارانەوە، دەبێتە هۆی چەکەرە پێکردنی هەستی نەمانی ئاسایشی ئابوری لەناخ ودەروونی خەڵکی دا، ئـەم حاڵەتانـەش چینـە بورجوازییـەکان بـەرەو لێوارەکـانی تـاوان ڕادەمـاڵێ بەتایبتـەتیش تـاوانی دارایـی لـەو کاتانـەدا کـە ئەترسـن شـوێن وپلـەو پایـەو دەسـتکەوتەکانیان بکەوێتـە مەترسـییەوە. چـــەندین توێژینـــەوە لـــەم بارەیـــەوە ئـــەنجام دراون ولـــێرەدا ئامـــاژە بەئەنجامـەکانی توێژینەوەکـەی زانـای تـاوان (لیـون راد زینۆفیـــچ) دەکـەین سەبارەت بە ناجێگیری وبەرزیو نزمی ئاستی گوزەران وکاریگەرییان لەسـەر تاوان بەتایبەتی لە وڵاتی پۆڵۆنیاو ژمارەیـەك وڵاتـی ئـەوروپا وئەمـەریکادا، گرنگترینیان ئەمانەن:-

1- پەیوەندی یەکی دیارو ئاشکرا هەیە لەنێوان تێکڕای هـەندێ تـاوان و کاتەکانی دابەزینی باری ئابوریدا، لە پۆڵۆنیا لـەکاتی خراپـی بـاری ئـابوریدا لـەنێوان سـاڵانی 1930-1933 تـاوانی دزی (دزینـی سـوتەمەنی خـەڵوز لـە شـەمەندەفەرەکان) دووبەرامبـەر زیـادی کـردووە وزۆربـەی دزەکـانیش لـە بێکار وئەوکەسانە بوون کەزۆر هەژار بوون، لەهەمان مـاوەدا ڕێـژەی تـاوانی ساختەکردن وناپاکی لە ئەمانەت زیادی کردووە.

2- تـاوانی دەرهـەق بەسـامان ومـاڵی خـەڵکی، واتـا دزی لـەکاتی دابـــەزین وخراپی باری ئابوری‌دا زیاد دەکات ولەکاتی هێمنـی وئـارامی بـاری ئـابوریدا کـەم دەبێتـەوە. بـەلاَم تاوانـەکانی دژ بەتاکەکەسـان وتـاوانی داوێـن پیسـی وسـوتاندن لـەکاتی هێمنـــی ئـابوریدا زیـاد دەکـات ولـەکاتی خراپـی بـاری ئابوری‌دا کەم دەبێتەوە.

3- لەکاتی خراپی باری ئـابوریدا ڕێـژەی تاوانبـاری سـەرەتایی وتاوانبـار بەرێکـەوت بـەرز دەبێتـەوە بـە بـەراورد کـردن لەگـەلْ تاوانکـاری کارامـەو کردەدا.

4- تێکڕای تاوان زیاتر دەبێت لەوکاتانەدا کەڕەوشـی ئـابوری تاکەکەسـان توندو تیژەو بەخێرایی گۆڕانی بەسەردا دێت.

5- شوێنەوارەکانی دابەزین وبەرزبوونەوەی باری ئابوری بەسەر تاوانەوە هەردەم هەنووکەیی‌یە وزۆربـەی جاریش ئەنجامـەکانی لـەدوای سـاڵێك یـان زیاترەوە دەردەکەون (87).

## قوتابخانەی مارکسیزم (ڕەوتی سیاسی)

کـــارل مـــارکس (1813-1882) وەك كێشـــەیەك لەكێشـــەكانی ڕژێمـــی سەرمایەداری بایەخی بەمەسەلەی تاوان نەداوە، بەڵام یەكەمین نووسینی لەو بارەیـەوە لـە كتێبـی ئایدولوژیـای ئـەڵمانیدا (1846) نووسـیوە، كەبـەهاوكاری لەگەڵ فریدریك ئەنگلس دا دایناوە ، بەشـی سـێیەمی ئـەو كتێبـەیان بـۆ ئـەم بابەتە تەرخان كردووە لە ژێر ناوی (مافەكان و تاوان و سزا)دا.

مارکس لەو توێژینەوە فەلسەفیەیدا مشتومڕ لەسـەر فەلسـەفەی هـێز و حـەق و ئـیرادە و كـار دابەشـكردن و یاسـاو دەوڵـەت دەكـات و، لـە نێــو ئــەو چەمكانەدا شوێنی تاوان و سزا دەستنیشان دەكات. مارکس ڕەخنە لـە دیـدی بورجوازی سەبارەت بەحەق و یاسا دەگرێت بەوپێیەی هـەردوكیان ڕواڵـەتن بۆ ئیرادەی گشتی نامۆ بوو لـە خـود، هـەروەها ڕەخنـە لـە دیـدی بورجـوازی دەگرێت لە تاواندا لـە سـەر ئەوبنەمایـەی كەتەنـها دەرچوونەلـە بنـەماكانی حەق و یاسا. مارکس پێیوایـە: ئـەو دووهەڵوێسـتە وەهمـی ئایدیالیسـتین و دوورن لەبنچینــەی مـاددی دیـاردەو شمــەكاكان چونكـە بــەلای ماركســەوە ئەوبنچینەیــە ســەرچاوەی ڕاســتەقینەیە بــۆ بەرقـــەراركردنی دەوڵـــەت و كاردابەشكردن وبوونی موڵكایەتی تایبـەتی و یاسادارشـتن و ڕوودانـی تـاوان، بەم دەستەواژەیە ئاكامەكانی كۆتایی پێدەپێنێت: تاوان دەرئەنجامی ئەو مل ملانێیانەیـە كـە لـەدڵی كۆمـەڵگای سـەرمایەدارییەوە سـەرچاوە دەگـرن، هــەروەها نــاكۆكی بــەردەوامی نێــوان تاكەكــەس و باروڕەوشـــی بـــاوی نێوكۆمەڵگاكەیەتی.

لەسـاڵی 1853 دا مـارکس ووتـارێکی لـەبارەی (سـزای لەسـێدارەدان)ەوە نووسیو تیایدا مشتومڕ لەسەرئەو ئامارانە دەکات کـەزانای بـەلجیکی ئـەدولف کوتلێـت توێژینـەوەی بۆکـردوون و جگـە لـە گوتەکـەی کوتلیـت لـەبارەی ڕێکبـەندی لـەدیاردەی تـاوادا،مـارکس هاوڕایـەتی و جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتەوە کە تاوان بە شێوەیەکی ڕێك و پێك وەك هەر دیاردەیەکی ماددی تـر ڕوودەدات و دەڵێت: زیاد بوونـی تـاوان بـەو ڕێکبەندییـە پەیوەسـتە بـە سـیما ڕیشەدارەکانی بونیادی ئابوری وکۆمەڵایەتی سەرمایەدارییەوە (89).

مـارکس لەسـاڵی 1863دا کتێبـی تیورەکـانی زێدەبـایی (نظریـات فضـل القیمة) بڵاوکردەوە و تیایدا ئاماژە بۆرەوشی تاوانبـاران دەکـات و بـەراوردی دەکـات لەگـەڵ پیشـە کۆمەڵایـەتی و ئـەو وەزیفانـەی کەسیسـتمی کاردابەشـکردن لـە کۆمـەڵگای سـەرمایەداریدا دەیخەنـەوە ، جـارێکی تریـش مـارکس ئامـاژە بۆبناغـەی مادیانـەی تـاوان دەکـات بـەڵام ئـەم جـارە ڕۆڵـی تاکەکەسی لەپێکهێنانی ڕەفتاری تاوانکاری بۆئیزافە کردووەو دەڵێت:

تاکەکەس بەشێوەیەکی کوێرانە مل کەچ ناکات بۆ باروزروفی بـاوی نێـو کۆمەڵگاکەی، بەڵکو بەکاردانەوەیەکی دیاریکراو وەڵامی دەداتەوەکـە جیایـە لـە کاردانـەوەی کەسـانی تـر،ئەمـەش بەرئـەنجامی بوونـی پەیوەندییـەکی دیالەکتیکییە لەنێوان زروفی مادی و تاکەکەسدا،ئـەو پەیوەندیـەش جـۆری کاردانەوەکـە دیـاری دەکـات(ئاسـایی بێـت یـان تاوانکـاری). لـێرەوە لـە نێـوان تاکـەکانی چینـی پرولتیاریـادا جیـاوازی دەکـاو دەڵێـت: هـەندێکیان مـل ملانێکەیان لەگەل زروفی ماددی باوی نێو کۆمـەڵگای سـەرمایەداری هانیـان دەدات، بۆ تۆکمە کردنی خەبات و تێکۆشان بۆگەیشتن بە سۆشیالیزم، بـەڵام هەندێکی تریان دەبنە تاوانبار، ئەم تاوانبارانەش دەسـتەیەکی مشەخۆرن و

لـەنزمترین چینـــەکانی پرولیتاریـــاوە دێـــن و، جێـــی بـــڕواو متمانـــەنین لەبەرئەوەی: دەستەوەستانن و بەشداری لە بەرهـەم هێنـاندا ناکـەن و بـارن بەسـەرخەلکیەوە و لەسـەردزی سـواڵ کـردن و قومـارو بەدرەوشـتی دەژیـن و،بەئاسـانی لەخشـــتە دەبرێـــن و فریودەخـــۆن و دەچنـــە ڕیـــزی چینـــی دەسەڵاتداروسەردەستەوەو سـیخوڕی بۆپۆلیـس دەکـەن یـان دەبنـە چەتـە و جـــاش و چـــەکدارو، بورجـــوازی و کۆنەپەرســـتان بۆبـــەرگری لـــەخۆ دژبەپرولیتاریا بەکاریان دەهێنن.

ئەنگلس گرنگی زیـاترو گـەورەتری بـەتاوان داوە ولـەکتێبی (ڕەوشـەکای چینـی کرێکـار لـە ئینگلتـەرا سـاڵی 1844) کەلەسـاڵی 1892 دا نوسـیویەتی، لەبەشـێکی گـەورەیدا توێژینـەوەی تایبـەتی و فراوانـــی بۆئـــەنجامداوە و دەڵێت: کاتێك پیشەسازی سەرمایەداری لەئینگلتەرە پەرەی گرت وسەقامگیر بوو، بووە هۆی گەندەڵ کردنی ئاکارو ڕەوشتی چینی کرێکارو ، نەوەکانیانی بـەرەو تـاوانکردن پاڵپێوەنـا، ئەمـــەش بـــەهۆی مامەڵـــەکردنی قـــورس و دلڕەقانەوە بوو کە بورجوازی لەگەڵ چینی کرێکاردا پیَی هەڵدەستا، ئینجا بەهۆی باروزروفی خراپەوە لە ڕووەکانی(فێرکردن و پەروەردەو ڕۆشنبیریو نیشتەجێکردن و سەعاتەکانی کارکردن و ...تاد و نەبوونی بیمـەی بێکـاری، و زامن نەکردنی ژیـانی کەمئـەندام بـوون و نـەخۆش کـەوتن و زەوتکردنـی ئازادیەکان و پێشێلی سەرجەم مافەمرۆڤایەتی یەکان،چینێك بەدەست ئـەم بارزروفـەوە بنـالێنێت (هـەروەك ئـەنگلس دەڵێـت) خـــۆی لەبـــەردەمی رێی تـاواندا دەبینێتـەوە و هیـچ ڕێگاچارەیـەکی تـری نییـە و هیـچ شـك نابـات و هـەموو دەرگاکـان بـەڕوویدا داخـراون ، هـەروەك چـۆن ئـاو مـل کەچـە بۆیاساکانی سروشت و لەپلەیەکی گەرمی دیاریکراو دا دەبێت بەهەڵم(90).

## تیوری فاکتەرە سروشتییەکان(جوگرافیای تاوان)

هەرلەکۆنەوە کارگەرییە جوگرافییەکانی وەك: کەشوهەواو سروشتی زەوی و ...تاد بەسەر مرۆڤ وکۆمەڵەوە زانراوەو دەکرێت بیگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی یۆنانییە کۆنەکان. هیپوکرات پزیشکی ناسراوی یۆنان (460-377پ.ز) تێبینی ئەوەی کردووە کە تەمەڵی و سستی و ترسنۆکی دانیشتوانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات پەیوەندی بەسروشتی کەش و ئاووهەوای ئەو ناوچانەوە هەیەو ، هێمنی دانیشتوانی ناوچە دەشتاییەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ کەش و ئاووهەوای ئەو ناوچانە.

لەسەدەی شانزەهەمدا هەمان بیرۆکە واتا کاریگەری ڕەوشی جوگرافی بۆ سەر پێکهێنانی میزاج وحەوسەڵەو ئارەزووەکانی تاکەکەس، جارێکی تریش سەری هەڵدایەوە و لە نێو کتێبەکانی مێژوونوسی فەرەنسی (بۆدان)دا هاتنەوە ئاراوە. زانای فەرەنسی مۆنتسکیۆ (ئەوبیرۆکەیەی کردە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی کتێبە بەناوبانگەکەی گیانی یاساکان (روح القوانین) کە لە ساڵی 1848دا بڵاوکراوەتەوەو ، تیایدا توێژینەوەیەکی دورو درێژی بۆ کردووە و تەنانەت کارگەرییە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی ئەو فاکتەرانەشی لە یەکتری جیاکردۆتەوە. بۆ نموونە دەڵێت: کەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر حەزو ئارەزوە سێکسییەکانی تاکەکەس بەڵام زەوی کاریگەی ناڕاستەوخۆی بەسەر ئەو لایەنەوە هەیە.

مۆنتسکیۆ یەکەمین توێژەرە کە ئاماژەی بۆ پەیوەندی نێوان تاوان و فاکتەرە حوگرافییەکان کردووەو لەو بارەیەوە یاسایەکی دارشتووە دەڵێت: هەتالە هێڵی یەکسانی نزیك ببینەوە ئەوا ڕێژەی تاوانکردن زیاتردەبێت و،

هەتا بەرەو باكور برۆین ڕێژەی تاوان دادەبەزێت، بۆیە دەبینین دانیشتوانی ناوچـەكانی بـاكور هێمـن تـرن و زیـاتر پەیوەسـتن بـە ئاكـارەوە، بـەلآم دانیشتوانی باشور سروشتیان تونـدەو هەست و سۆزیان ڕەق و نائارامـە كـە ئەمەش یارمەتیدەرە بۆزیاد بوونی تاوان كردن،بەلآم دانیشتوانی ناوچە مام ناوەندیـیەكان لـە ئاكـارو ئارەزووەكانیشـیاندا هـەرمامناوەندین و توندڕەونین (91).

گـەرچی ئـەو دیـدو بۆچوونـە بـە تەنـها لێكدانـەوەو تێرامـانی مۆنتسكیۆیە،بـەلآم لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە مـەیدانی توێژینـەوەكانی تـاواندا سـەرنجی چـەندین زانـای وەك (كوتلیت و لاكاسـان و ڤـۆن لیسـت)ی بـەلای خۆیدا ڕاكێشاوە و تێبینی یان كردووە، ئەوەتا كوتلیت یاسایەكی بەناوبانگی بەناوی(یاسای گەرمی لەتاواندا) دارشتووە لەناوەرۆكی ئەو یاسایەدا هـاتووە كە تاوانی دژ بە تاكەكەسان لە ناوچـەكانی باشوردا بـەربلآوە، بـەلآم تـاوانی دژبە سامان و موڵكەكان زیاتر لە ناوچەكانی باكوردا دەبینرێت. یـەكێك لـە پسپۆرە ئەمریكیـیەكان بەناوی (مایوسمس)ەوە بانگەشـەی ئـەوە دەكات كـە توێژینـەوە نوێـیـەكان پاڵپشـتی لەیاسـاكەی كوتلیـت دەكـەن و دەڵێـت: ئامارەكان جـەخت لەسـەر ئـەوە دەكەنـەوە كـە تـاوانی دژ بەسامان و موڵك لەناوچـەكانی بـاكوردا زۆرن و، تـاوانی دژ بـە تاكەكەسـانیش لـە باشـوردا بـەربلآون. لـە دوای ئـەوەوە دێكستێرDexter توێژینەوەیـەكی كـردووە بـۆ كاریگـەری ڕاسـتەوخۆی میترۆلوجیـا وەك حالەتـەكانی فشاری هـەواو پلـەی گـەرمی و ڕادەی شـێ و ڕەوتـەكانی بـا، لەتوێژینەوەكـەیدا بـەم ئەنجامانـە گەیشـتوە: ڕێـژەی سـەدی تاوانـەكان بەشـێوەیەكی ڕاسـتەوخۆ لەگـەل زیـاد بوونی پلەی گەرمی وڕادەی شێ و كەمی پەستانی هەوادا زیاد دەكات (92).

هەندێ لە زاناکان هەوڵیان داوە ئەم ئەنجامانــە بــەوە وا لێکبدەنــەوە کــە گوایــە پلــەی گــەرمی بــەرز جەســتەی مــرۆڤ بــێزارو هەراســان دەکــات وای لێدەکات زوو توڕەببێت و هــەڵبچێت، بۆیــە دانیشــتوانی ناوچــە گەرمــەکان تــورەو هــەڵچووترن ئەگــەر بــەراوردیان بکــەین لەگــەڵ دانیشــتوانی ناوچــە ساردو مام ناوەندییەکاندا. ئەم لێکدانەوەیە زۆر وردو زانستی نییە چونکــە دەرکــەوتووە دانیشــتوانی هــەندێك ناوچــەی هەرێمــە گەرمــەکان لەوپــەری سستی و تەمــەڵیدان بــەجۆرێکن کــە نــاتوانرێت بــەهیچ هۆکــارێك هەســت و سۆزیان جۆشبدرێ و بوروژێنرێت.

لومــبرۆزوش ئــەوەی بــۆ دەرکــەوتووە کــەژمارەی تاوانــەکان لەباشــوری ئیتالیادا زیاترن لەژمارەی ئەو تاوانانەی لەباکوری ئیتالیادا ئەنجام دەدرێن. هــەروەها دەریخســتووە بڵاوبوونــەوەی تــاوان لەبەشــەکانی باشــوری ئــەوروپا زیــاترە لەبەشــەکانی بــاکوری ئــەوروپا وەك وڵاتــانی ئــەڵمانیاو دانیمــارك و بەریتانیا (93).

زۆربــەی توێژینــەو و ئامــارە هەمــەجۆرەکان لەچــەندین وڵاتــی دنیــادا دەریانخســتووە کــەڕێژەی تــاوانی دژ بەتاکــە کەســان لــەوەرزی هــاویندا زیــاتر بەرز دەبێتەوە، بەڵام تاوانی دژ بەماڵ وسامان لەزستاندا زیاتر دەبێت.

لومــبرۆزۆ بــۆ جــەخت کردنــەوە لەســەر تیورەکــەی، سودی لەوئامارانــە وەرگرتووە کە (ڤێری) بەدەستی هێناون ســەبارەت بــەجۆری ئــەو تاوانانــەی لــە مانگــەکانی ساڵدا ڕوودەدەن بەپشــت بەســتن بــەتۆمارە حکومییــەکانی فەرەنسا بــۆ هــەموو ئــەو ساڵانەی دەکەونــە نێــوان (1825- 1878) وە، بــۆی دەرکەوتووە کە:

- تاوانی كوشتنی منداڵ، ڕاستەوخۆ پاش لەدایك بوونی، لەمانگەكانی (كانونی دووەم، شوبات، مارت، نیسان) دا زۆرترن و بڵاون. ئەم مانگانەش دەكەونە دوای تێپەڕبوونی نزیكەی نۆمانگ بەسەر ئەو گەرمایەدا كەلەمانگی تەموزدا دەگاتە ئەوپەڕی وتیایدا تاوانی زیناكردن زۆر دەبێت.
- تاوانی كوشتن و دەستدرێژی كردنە سەرتاكەكەسان لەمانگی تەموزدا دەگاتە ئەوپەڕی سنورەكانی.
- تاوانی سێكسی دژ بەمنداڵان لەمانگەكانی ئایارو حوزەیران وئابدا زیاد دەكات، بەڵام لەمانگی كانونی یەكەمدا بەنزمترین ڕادە دەگات.
- تاوانی سێكسی (زینا) لەمانگی حوزەیراندا دەگاتە ئەو پەڕی ولەمانگی تشریندا دەگاتە نزمترین ئاست.

ئەو ئەنجامانەی خرانە ڕوو پەیوەندی نێوان وەرزەكانی ساڵ وڕادەی تاوانكردن بەرجەستە دەكەن.

گەرچی زۆرێك لەزاناكان هەتا ئەمڕۆش گومانیان لەو ئامارانە هەیە وپێیان وانیە كەگەرما بەو ڕادەیە كاربكاتە سەر مرۆڤ و بەرەو تاوان كردنی ببات. بەڵام ئەگەر بۆ سروشتی شتەكان بگەڕێینەوە، دەكرێت جەخت لەسەر ڕاستی تیورەكە بكەینەوە بەوەی كەسروشتی مرۆڤ لە ژێر كاریگەری گەرمادا زیاتر هەراسان دەبێت وهەڵدەچێت، هەروەك چۆن یەكانگیربوونی زیاتری خەڵكی ئەبێتە هۆی دەستدرێژی بۆسەر تاكەكەسان. بەڵام زۆری تاوانی دزی كەدژ بە ماڵ وسامانی خەڵكین لەزستاندا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی خەڵكی لەو وەرزەدا زیاتر دەخزێنە نێو ماڵەكانیانەوە ونایەنە دەرەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا یارمەتی دزەكان دەدات بێنە نێو

ماڵەکان یان ڕێگاوبان لە خـەڵکی بگـرن بـەهۆی کەمبونـەوەی هاتوچۆکـەران بەسەر شەقامەکاندا لەبەر سەرماو نزمی پلەی گەرمی (94).

ڕەنگە فاکتەرە جوگرافی‌یەکان کاریگەری ڕاستەوخۆیان بۆسـەر هـەندێ کـەس هـەبێت و بیکـەن بـەتاوانبار، بــەڵام بەشــێوەیەکی گشـتی کاریگـەری فاکتەرە جوگرافی‌یەکان ناڕاستەوخۆن چونکە کاردەکەنە سـەر ئـابوری وڵات وئاستی بژیوی و، توانای بەرهەم هێنان ودابەشکردنی سامان دیاری دەکـەن، هـەروەها دەبنـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی برسـێتی وهــەژاری وکەئــەم دوانــەش فاکتەری گرنگی تاوانکردنن.

## تیوری لاسایی کردنەوە (تارد)

گـابریێل تـارد (1843- 1904) فەیلەسـوف وزانـای بوارەکـانی تـاوان وکۆمەڵناسی وسایکۆلۆژیا، هەموو ژیانی خۆی بۆ لێکۆڵینـەوەی دیـاردەی تاوان تەرخان کردووەو چەندین کتێبی لەو بوارەدا نووسیووە وەك: تـاوانی بەراوردکاری (1890)، ویاساکانی لاسایی کردنەوەو، فەلسەفەی سزا (1891) و، توێژینـەوە سـزاییو کۆمەلاٌیەتی‌یـەکان. ئـەم کتێبانـە وژمارەیـەك لـەووتارو توێژینـەوەکانی بوونـە هـۆی بـەرپاکردنی شۆڕشـێکی مـەزن لەزانسـتەکانی تاوان وسزا وسیاسەتی تـاوان، وبـەردی بناغـەی قوتابخانـەی کۆمەلاٌیـەتی‌یان لەتاواندا داڕشت لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا (95).

بـەلای تـاردەوە تـاوان دیاردەیەکەو لـەژێر کاریگـەری یـادەوەری وخـوودا ڕوودەدات، بـەهۆی پـەیوەندی تاکەکەسان لەگـەڵ یـەکتریدا وبـەپێی یاسـا چەسپاوەکان بەرجەستە دەبێت. تارد بۆ لێکدانەوەی تاوان هـەردوو زانستی سایکۆلۆژیاو کۆمەڵناسی ئاوێتـە دەکـات (96). لـێرەدا پوختـەی تیورەکـەی دەخەینە ڕوو:

هـەموو چەشـنەکانی ڕەفتـاری مرۆڤایـەتی لـەژێر کاریگـەری نموونـەی لاسایی کراوەدایـەو پـاڵ بەخەڵکی‌یـەوە دەنێـت بـۆ شـوێن پێ‌هـەلگرتنی، ئەمـەش بەرئـەنجامێکی سروشـتی پـەیوەندی تاکەکەسـانە لەگـەڵ یـەکتریدا وهاوژینییانە لەنیو یـەك کۆمـەلگادا. لێرەدا لەنموونەیـەکدا ئـەم بیرۆکەیـە ڕوون دەکەینەوە: حەشامات (الحشد) یـان کۆبوونـەوەی فراوانـی ژمارەیـەك مـرۆڤ کـە یـەکتری ناناسـن وجیاوازییـان لـەنێواندا هەیـە، کەلەشـوێنێکدا

کۆدەبنەوە (تەنها  کۆبوونـەوە) بـەهۆی سـۆزو عاتیفـەوە، کـاتێك ئـەو سـۆزو عاتیفەیە کڵپە دەگرێت وهـەمویان بارگـاوی دەبـن وپـەتای هـەڵچوون دەیـان گرێتـەوە فەوارەیـەکی نـوێ پێـك دەهێنـن، فەوارەیـەکی گونجـاوو تەباویـەك دەنگ وخاوەن هێزی لەڕادەبەدەر، وەك لافاوێك ڕووەو ئامانجەکـەیان دەچـن وئاستەمە بـەرگرییان لێبکرێـت، زۆربـەی ئـەو خەڵکانـەش کـەبۆ شـوێنی کۆبونەوەکە هـاتوون تەنـها بـەهۆی پاڵنـەری خۆهەڵقورتانـدنـەوە هـاتوون وبەس، بەلاَم حەماسەت وخوێن گەرمی کێشیان دەکات ودەیانبزوێنیّ.

ئەگەر تەماشای دیاردەی کوشتن بکەین بەهەموو شێوەکانیەوە، دەبینین ڕەفتارێکە وتاکەکـەس بـەهۆی لاسایی کردنـەوەی کەسـانی تـرەوە پیـادەی دەکات. ئایا دەشێت کەسێك یەکێکیتر بکوژێت بەبێئەوەی پێشتر  کـردەوەی کوشتن بوونی نەبووبێت؟

هـەموو لایەنــە باشــەکانی کۆمــەڵگا (بەربــەری وشارســتانیەکان) وەك بەخشندەیی ودەسـتپاکی وڕاسـتگۆیی وچاکـەکردن و، لایەنـە خراپـەکانی وەك دڕندەیـیو گـەندەڵی وسـیحرو دزی وئەشـکەنجەدان وکوشـتنی دیـل ومنـداڵ تـیرۆرکردنی سیاسـەتمەدارو نـەیارو.....تـاد، هـەموو ئەمانـە لەشـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکی تر دەگوێزرێنەوە ووەك لاسایی کردنەوەی کەسانی تر پیادە کراون.

## لاسایی کردنەوە بەلای تاردەوە پشت بەسێ یاسای چەسـپاو دەبەستێت کە بریتین لە:

<u>یاسای یەکەم</u>: تاکەکەسان بەهۆی  پـەیوەندی بـەهێز وقوڵی نێوانیانـەوە لاســایی یــەکتری دەکەنــەوە، بۆیــە لــەنێو کۆبونــەوەو لەشــارەکاندا لاساییکردنەوە دەردەکـەوێت لەبــەر ئــەوەی ژیانیــان پــڕە لــە کارتێکـەرو

چالاکیو، خەڵکی پەیوەندیان بەیەکەوە بەهێزە، بەڵام لەلادێدا کەرەسەی ڕاگەیاندن کەمەو چالاکی وکارتێکەرەکان لاوازن ولاسایی کردنەوەش لاوازە.

یاسای دووەم: لاسایی کردنەوە لەبەرزەوە بۆ نزم دێت، بچوك لاسایی گەورەو، هەژار لاسایی دەوڵەمەندو، بەرفرمان لاسایی فەرمانده دەکاتەوە. حاڵەتەکانی مەی نۆشین وجگەرە کێشان وبەرەڵلابوون و سووتاندن و ساختەکردنی پارە ودراوو بەرتیل ودەستدرێژی سێکسی وکوشتن بەژەهرو بەکرێگرتنی پیاوکوژ وتیرۆری سیاسەتمەدارو کوشتنی منداڵ وکۆرپەلە لەباربردن....تاد، ئەم تاوانانە لە بنچینەدا کاری بنەماڵە دەسەڵاتدارو پادشاکان وچینی باڵا وئەفسەرە پلە بەرزەکان بوون وپاشان بەناو چینە کۆمەڵایەتییەکانی تردا بڵاوبوونەتەوە. لەدوای نەمانی پادشایەتییەوە داهێنانی جۆرەها تاوان وکەرەسەی جێبەجێکردنیان گوێزرانەوە بۆ شارە گەورەکان، بۆنموونە دەستدرێژی سێکسی بۆسەر منداڵ لە فەرەنسا لەسەدەی نۆزدەهەمدا تەنها لەشارەگەورەکانی وەك پاریس وتۆلۆزو مارسیلیادا بینراوە بەڵام دواتر بەناو هەموو شارو ناوچەکانی تری فەرەنسادا بڵاو بۆتەوە.

یاسای سێیەم: یاسای ئاوێتە بوون Insertion یان تێهەڵکێش بوونی مۆدەو نەریت و، نوێ بوونەوەیان وجێگرتنەوەی مۆدەیەك بە یەکێکی تر بۆ نموونە: کوشتن بەچەقۆ نەریتێك بووە وزۆربەی گەلان ناسیویانە وزانیویانە، کاتێك مۆدەی کوشتنی بەدەمانچە هاتە ئاراوە، جێی بەچەقۆ لێژکرد وشوێنی گرتەوە وزیاتر پەرەی گرت وبڵاوبووە. خونەریتی مەست بوون وەك مۆدەیەك تیرە وخێڵە ئەفریقیەکان لە ئەوروپیەکانەوە خواستویانە وپاشان لەمۆدە دەرچووە ورەگ وریشەی لەدەروون وناخیاندا داکوتاوەو بووە بەنەریت (97).

## چەمکە تەواوکاریەکانی تیوری لاسایی کردنەوە:

لە لێکدانەوەی ڕەفتاری تاوانکاریدا وبۆتەواوکردنی بونیادی تیورەکەی، تارد چەندین چەمکی بەکارهێناوە، لێرەدا ئاماژەیان پێدەدەین:-

**یەکەم: نموونەی کردەو لێهاتوو:**

بەلای تاردەوە تاوانبار هەردەم نموونەیەکی کردەو کارامەبووە، دزو پیاوکوژ وگیرفانبڕ وبەدڕەوشت، ئەمانە ئەوکەسانەن کەلە زەمەنێکی درێژدا پڕۆڤەو ڕاهێنانیان لەسەر کاروپیشەکەی خۆیان کردووە هەروەك چۆن پزیشك وئەندازیارو هونەرمەندەکان پڕۆڤە ومەشقی بەردەوامیان هەیە. هیچ تاوانبارێك بە تاوانباری لەدایك نابێت، بەڵکو بارو ڕەوشی کۆمەڵایەتی، کەش وهەوایەکی لەباری بۆ فەراهەم کردوون وزەمینەی نزیك بوونەوەی لە هاوڕێی خراپ بۆ خۆش کردوون ولەوێوە پەتای تاوانکردن بۆ ئەمانیش گوێزراوەتەوە.

تاوانکارە کردەوە لێهاتوەکان ژیانێکی تایبەت بەخۆیان هەیەو، زمان و چەمکەکانیان تایبەتە وهەرخۆیان لێی تێدەگەن وبەشێوازێکی جیا ژیانی ڕۆژانەیان دەگوزەرێنن و، تەکتیکی هەمە جۆر لەکردنی تاواندا بەکاردەهێنن ویاسایەکی ئاکارییان هەیە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی یەکانیان بەیەکتری یەوە.

**دووەم: پۆلێن کردنی تاوانباران:**

بەپێی چەمکی نموونەی کردەو لێهاتوو، تارد تاوانباران پۆلێن دەکات بۆتاوانباری شاری وتاوانباری لادێی. تاوانبارەکانی شار ئەوانەن کەخەڵکی شارن وتاوانەکانیان سیمای ژینگەکەیانی هەڵگرتووەو، گیانی بازرگانی

وپیشەسازی وپێداویستیيە ماددییە هەمەجۆرەكان و كاروباری فیكری پێوە دیارە وەك تاوانەكانی: دزیو ساختەكردن وگیرفانبڕین، واتا تاوانەكان دژ بەسامان ودارایین. بەڵام تاوانباری لادێی ئەوانەن كەلەگوندەكاندا دەژین وخەریكی كشتوكاڵن وتاوانەكانیان زیاتر توندو تیژی پێوە دیارە وەك كوشتن ولێدان، واتا تاوانەكان زیاتر دژ بەتاكەكەسە نەك دارایی بێت (98).

سێیەم: لێپرسراوێتی ئاكاری:

لێپرسراوێتی ئاكاری پشت بەدوو ڕەگەزی سەرەكی دەبەستێت كەبریتین لە (شوناسنامەی تاكایەتی وهاوتایی كۆمەڵایەتی). بۆ ئەوەی تاكەكەس بەلێپرسراوی كردەوەكانی هەژمار بكرێت، پێویستە وەك خودی خۆی بمێنێتەوە وبەدەست هیچ جۆرە پەشێویيەكەوە نەناڵێنێت وەك حاڵەتەكانی: پەشێوی عەقڵی (شێتی وپەركەم) یان مەستی وسەرخۆش بوون، یان نەخەوێنرابێت بە خەواندنی موگنانیسی، یان لە تەمەنێكدا نەبێت كەتوانای پەی بردنی نەبێت، ئەوەیە مەبەست لەشوناسنامەی تاكایەتی. بەڵام هاوتایی كۆمەڵایەتی بەلای تاردەوە گەیاندنی نێوان تاكەكانی كۆمەڵگایە، بەمانایەكی وردتر دەبێت بكەرو بەركار (واتا تاوانبارو قوربانیەكە) ئەندامی یەك كۆمەڵگابن و بەڕادەیەكی پێویست گەیاندنی كۆمەڵایەتییان لەنێواندا هەبێت وئەو بوارە بڕەخسێت كەپرۆسەی لاسایی كردنەوەكە ڕووبدات.

چوارەم: سیستمی سزادان:

تارد بەپشت بەستن بەتیورەكەی لەلاسایی كردنەوەدا، چەند بنەماوپرانسیپێكی بۆ سیستمی سزادان داناوە. ئەو ڕەخنە لەسیستمی سوێند خۆران دەگرێت وپێشنیاری پێكهێنانی لیژنەیەك دەكات بۆكاركردن لەگەڵ دادگای سزاییدا، لیژنەكەش لە پزیشك وزاناكانی سایكۆلۆژیا پێك

بێت. ئەو لیژنەیە دیاریکردنی لێپرسراوێتی تومەتبار لەئەستۆ بگرێت، ئینجا لە دوای دیاری کردنی لێپرسراوێتی‌یەکە، سزاکەش لەسەر بنەمای سایکولوژی بڕیاری لەسەر بدرێت.

بەلای تاردەوە دیاریکردنی سزا بۆ هەموو تاوانێك هەڵەیەکی گەورەیە. ڕاستە دەبێت سزای هەموو تاوانبارێك بدرێت بەلاّم دیاریکردنی سزاکە دەبێت پشت بەڕادەی ئەو دابڕانە (الحرمان) ببەستێت کەسزاکە بۆ تاوانباری دروست دەکات. تارد پیّ‌ی وایە دادپەروەری لەوەدانیە یەك سزای بەندکردن بەسەر هەردوو تاوانباری شاری‌و لادێیی بسەپێنرێت چونکە تاوانبارە شاری‌یەکە لەنێو بەندیخانەدا لەزۆر شت دادەبڕێت کە تاوانبارە لادێیی‌یەکە لەژیانی ئاسایی خۆیدا نەیدوون ونەیزانیوون.

تارد پێشنیار دەکات پەیمانگایەك بۆ دادوەری سزادانان بکرێتەوە وتیایدا کۆمەڵناسی‌و سایکۆلۆژیاو یاسای سزاکان وتەواوی زانستە سزایی‌یەکانی تر بخوێنرێت. تارد بانگەشەی جیاکردنەوەی بەندکراوەکان دەکات بەپیّ‌ی باگراوندی کۆمەلاّیەتییان بەتایبەتی جیاکردنەوەی تاوانباری شاری لەتاوانباری لادێیی، هەروەها داوای پراکتیزەکردنی بەند کردنی تەنهایی دەکات، چونکە دەبێتە هۆی ڕێگرتن لەتێکەڵ بوونی تاوانباری تازەی کەم ئەزموون لەگەڵ تاوانکاری کردەو ئەزمووندااردا تاکو فێری تەکنیکی تاوانکردن نەبن لێیانەوە. هەروەها تارد ستایشی سیستمی ئازدکردنی مەرجدار دەکات وداوا دەکات بەشێوەیەکی فراوان جیّبەجیّ بکرێت تاکو بەندکراوەکان هانبدات ڕەفتاری خۆیان بگۆڕن.

سەبارەت بەسزای لەسێدارەدان، تارد پیّ‌ی باشە بوونی هەبێت وبسەپێنرپێت سەرەڕای ئەو کەموکورتی‌و ناتەواویانەش کەهەیەتی ودەڵێت: بۆ باروڕەوشی ئێستا شەڕێکەو ناچارین بیکەین، بەلاّم دەبێت

بەشـێوەیەکی دڕندانــە جێبــەجێ نــەکرێت تــاکو بەنکراوەکــە لــەکاتی جێبەجێکردنیدا هەست بەئازار نــەکات. لەهـەموو حاڵەتـەکاندا تـارد پـێی وایە دەشێت سزای لەسێدارەدان هەڵبوەشـێنرێتەوە ئەگـەر بۆمـان دەرکـەوت هیـچ سـودێکی لێناکەوێتـەوە، ئەوسـا باشـتر وایـە بگۆڕدرێـت بـۆ سیسـتمێکی سـزایی تـر کەتاڕادەیـەکی بـەرچاو ئـازارو ئەشـکەنجە بـەتاوانکارە گـەورەکان بگەیەنێت و، پێویستە کار بەسزای جەستەیی بکرێت (99).

## هەڵسەنگاندنی تیورەکەی تارد:

بـەلای تـاردەوە تـاوان دیاردەیـەکی نائاسـایی وبێکەڵکـە، بەنەخۆشـی کۆمەڵایـەتی دانـاوەو، دەڵێـت وەك شـێرپەنجە وایـە کەلـە جەسـتەی مرۆڤـدا دروست دەبێت بەرو فەوتاندنی دەبات. تاوان پیشەیە وڕۆشنبیریو کەلتوری کۆمـــەڵگاو ژینگــەی کۆمەڵایــەتی دروســتی دەکــەن، پیشــەیەکی خــراپ ونێگەتیفـە وتەنـها لەوکۆمەڵگایانــەدا پــەرە دەگرێــت کــەناڕێك وپێکــەو ڕەگەزەکانی پەتاو نەخۆشی کۆمەڵایەتی تیایدا باووبڵاون. ئـەم هەڵوێستەی تارد لەزۆر لایەنەوە ڕاست و دروستەو، زۆرێك لەتوێژینەوەکان سەلماندویانە کەتێکـەڵ بـوون وگـەیاندنی نێـوان تاکـەکانی کۆمــەڵ، ڕێخۆشــکەرە بــۆ گواســتنەوەی دیـاردە کۆمەڵایەتیـیـەکان وپەرەســەندنیان بەتایبــەتی بــۆ گواسـتنەوەی نــەریت و ڕەفتارەکـان کەلـەتاواندا خۆیــان دەبیننــەوە وەك تاوانــەکانی: خۆکوشــتن، پەنابردنەبــەر مــادە ســڕکەرەکان، مــەی نۆشــین، ســوالکردن، وبــەرەڵلایی، ڕفــاندن و بەدڕەوشــتیو قومــارکردن وبــەرتیل وەرگرتن و کوشتن وتاوانی ئابوری....تاد.

بـەلام ئـەم لایەنـە باشـەی تیورەکـە ناگاتــە ئــەو ئاسـتەی خـاڵی لاوازی سەرەکی تیورەکە دابپۆشسێت کەبریتییە لە بایـەخدانی گـەورە بەپرۆسـەی

لاسایی کردنەوەو، جەخت کردنەوە لەسەر پێکهێنانی سەرجەم چەشنەکانی ڕەفتار تەنها وتەنهالەڕێی پرۆسەی لاسایی کردنەوە. ئەم هەڵوێستە خۆی لەخۆیدا ئاسانکردنی هۆکارەکانی تاوانەو تێڕوانینێکی کورت بینە وهەموو هۆکارەکانی تاوان لەخۆناگرێت. بۆنموونە تاوانەکانی مەی نۆشینو خۆکوشتنو سوالکردن وبەدڕەوشتی، مەرج نیە تەنها بەهۆی لاسایی کردنەوەوە تاکەکەسان وەریبگرن، زیاتر بەهۆی پاڵنەری ئابوری و کۆمەلأیەتیەوەن. تارد بەتەواوەتی فاکتەری ئابوری فەرامۆش دەکاتو هیچ بایەخێکی پێنادات.

هەروەها تارد لەڕاڤەکردنی یەکەمین تاوان لەمێژووی مرۆڤایەتیدا خۆی نەبان دەکات وهیچی لەوبارەیەوە نەدرکاندووە. لەلایەکیترەوە تاکەکەسان هەموویان وەکو یەك وەلأم بەئیحاکان نادەنەوە و، هەندێ کەس بەهیچ جۆرێك ئیحاکاریان تێناکات، چونکە وەلأمدانەوەکانیان پەیوەستە بەسروشتی ڕۆشنبیری وپێکهێنەرەکانی کەسێتیانەوە. هەروەها ئەگەر تاوان لاسایی کردنەوەیە، بۆچی تەنها ژمارەیەك لەخەڵکی لاسایی تاوانباران دەکەنەوەو زۆربەی زۆری خەلك لاسایی ڕەفتاری لادەرو تاوانکاری ناکەنەوە.

لە کۆتایدا دەبێت ئەوەش بڵێین کەتیورەکەی تارد یەکێکە لەتیورە بەناوبانگ و پێشەنگەکانی قوتابخانەی کۆمەلأیەتی لەتاوانداو، دیدو بۆچوونەکانی تارد ڕۆڵێکی مەزنیان هەبووە لەبوارەکانی: دادگای مێرد مندالأن وسزای لەسێدارەدان وپۆلێن کردنی بەندکراوەکان وسیستمی ئازادکردنی مەرجدارو... تاد، هەتا ئەمرۆش لەزۆربەی یاساکانی سزادانیدا بەهەند وەردەگیرێت وکاریان پێدەکرێت (100).

## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

. العاني، محمد شلال وطوالبة، علی حسن (1998): علم الاجرام والعقاب، ط1، دار المسيرة، عمان ص14.

. هەمان سەرچاوە، ل 18.

. عريم، عبدالجبار (1966): نظريات علم الاجرام، ط3، مطبعة المعاريف، بغداد، ص8.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل14.

. هەمان سەرچاوەی ژماری (3) ل33.

. ابو عامر، محمد زكي (1981): دراسة في علم الاجرام والعقاب، دار الجامعة، بيروت، ص17.

. الدوری، عدنان (1989): علم العقاب والمعاملة المذنبين، ط1، دار ذات السلاسل، الكويت، ص14.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (3) ل34.

. الحفني، عبدالمنعم (1978): موسوعة علم النفس والتحليل النفسي، ج2، دار العودة، مكتبة مدبولي، بيروت، ص99.

. هەمان سەرچاوەی ژماری (3) ل35.

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل25.

. حبيب، محمد شلال (1985): اصول علم الاجرام، ط1، دار الكتب، جامعة بغداد، ص17.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل21.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (3) ل35.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (6) ل26.

. عقيدة، محمد ابو العلا (1995): اصول علم العقاب، دار الفكر العربي، القاهرة، ص8.

. طالب، حسن (1997): علم الاجرام، الجريمة، العقوبة والمؤسسات الاصلاحية، دار الفنون، بيروت، ص11.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (3) ل36.

. هەمان سەرچاوە، ل41.

. ________ (ب.ت): اصلاح المجرمين، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ص26

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (12) ل64.

. السراج، عبود (19985): علم الاجرام وعلم العقاب، ط3، الكويت، ص183.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (3) ل69.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل61.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (3) ل69.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (22) ل187

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل60.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (22) ل186.

. ابو عامر، محمد ذكي وثروت، جلال (1983): علم الاجرام والعقاب، دار الجامعة، بيروت، ص208-209.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (6) ل113

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (29) ل205

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (22) ل195

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (29) ل206

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل63

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (3) ل72

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل64

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (22) ل219

. السلطاني، يحيى (1977): علم نفس (الغدد الصماء)، مطبعة النعمان، النجف، ص97.

. هەمان سەرچاوە، ل131

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (22) ل220

. هەمان سەرچاوە، ل222

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (12) ل197

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (6) ل138- 141

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل145- 150

. الالوسي، جمال حسين وعلي خان، اميمة (1983): علم نفس الطفولة والمراهقة، مطبعة جامعة بغداد، ص289.

. محمد، وهبية شوكت (1990): العوامل النفسية في جنوح الاحداث، مطبعة الحوادث، بغداد، ص6.

. السراج، عبود (1999): الوجيز في علم الاجرام وعلم العقاب، ط8، مطبعة قمحة اخوان، جامعة ديمشق، ص105.

. هەمان سەرچاوەی ژمارى (1) ل131

. هەمان سەرچاوەی ژماری (47) ل107

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل228

. هەمان سەرچاوە، ل229

. دافيدوف، لندا ل (1988): مدخل علم النفس، ترجمة سيد الطواب واخرون، دار ماكجروهيل ودار الدولية، القاهرة، ص103.

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل118

. هەمان سەرچاوەی ژماری (47) ل110

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل127

. هەمان سەرچاوەی ژماری (47) ل111

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل127

. هەمان سەرچاوەی ژماری (47) ل112

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل241

. هەمان سەرچاوە، ل243

. هەمان سەرچاوە، ل244

. ئیرۆس لە ئەفسانەی یۆنانی کۆندا خواوەندی خۆشەویستییەو فرۆید ئەم چەمکەی بۆ گوزارشتکردن لە غەریزەی خۆشەویستی بەکار بردووە کەبریتییە لە تێکڕای هێزە زیندەگییەکان وپاڵنەرە غەریزەییەکان کەئامانجیان دەستکەوتنی چێژە (لەززەت) وپارێزگاریکردنە لەجۆرو لەززەتی سێکسی. شایانی باسە فرۆید چەمکی سێکسی بەمانایەکی فراوان بەکارهێناوە وەك ئاماژەیەك بۆ هەموو چالاکییەکی جەستەیی بەئاقاری تێرکردنی پێداویستییە جەستەییەکاندا، هەروەها بەمەبەستی دەستکەوتنی لەززەت ودوورکەوتنەوە لەئازارو ژان. ئەو هێزەش کەئەم پاڵنەرە دەبزوێنێت ناوی ناوە لەبیدۆ Libido

. ساناتۆس له ئەفسانەی یونانی کۆندا خواوەندی مەرگە، فرۆید ئـەم چەمکـەی وەك غـەریزەی ڕوخـاندن ومـەرگ وشـەڕانگێزی خواسـتوە کـە ئامانجی لەبەر یەك هەڵوەشانی پەیوەندییەکانـەوەو وێرانکردنـی شـتەکانە بۆئەوەی بوونەوەری زیندوو بگۆڕێت بۆ ماددەی نائەندامی.

. شلتز، دوان (1983): نظريات الشـخصية، ترجمـة حمـد دلي الكربـولي وعبدالرحمن القيسي، مطبعة جامعة بغداد، ص34.

. منصـور، طلعـت واخـرون (1978): اسـس علـم النفـس العـام، مكتبـة الانجلو المصرية، كلية التربية، جامعة عين شمس، ص340.

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل72

. هەمان سەرچاوەی ژماری (64) ل36

. هەمان سەرچاوەی ژماری (65) ل341

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل73

. هەمان سەرچاوەی ژماری (64) ل37

. هەمان سەرچاوەی ژماری (65) ل342-346

. هەمان سەرچاوەی ژماری (64) ل42-46

. زهران، حامد عبدالسلام (1977): الصحة النفسـية والعـلاج النفسـي، ط3، عالم الكتب، القاهرة، ص41-47.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل75.

. ئۆدیب ئەفسانەیەکی یۆنانیـیـەو (سـۆفۆکلیس) لەداسـتانی (ئۆدیـب شاه) دا دەیگێڕێتەوەو تیایدا هاتووە: ئەستێرەناسێك پێشبینی بۆ (لایـوس) پادشای (سیبس) دەکات کە کوڕەکەی گەورە دەبێت ودەیکوژێت. بۆیە لەگەڵ لەدایك بوونی ئۆدێبی کوڕیدا دەیبەن لەسەر چیای (شـتیرۆن) فڕێـی دەدەن،

پاشان شوانێك هەڵیدەگرێتــەوەو دەیبـات بـۆ (كۆرنیـس) شـا، ئـەویش لـەلای خۆی پەروەردەی دەكات. كاتێك ئۆدێب گەورە دەبێت لەگەشـتێكدا بـەباوكی ڕاستەقینەی خۆی دەگات (بەبێ ئەوەی یەكتری بناسنەوە) و شەڕ دەكەوێتە نێوانیانـەوە لـەئاكامدا ئۆدێـب بـاوكی خـۆی دەكوژێـت، ئینجـا ڕێی خـۆی دەگرێت بەرەو (سیبس) بۆ ئـەوەی ببـێ بەپادشـای ئـەو مەملەكەتـەو لـەوێ شاژن مارەبكـات (كـەدایكی ڕاسـتەقینەی خۆیـەتی ویـەكتری ناناسـن) كـاتێك ئەسـتێرە ناسـەكان ئـەم حەقیقەتـە بـۆ ئۆدێـب دەگێرنـەوە ئـــەویش لـەتاوا گوێردەبێت و دایكی خۆی دەكوژێت وئەو مەملەكەتە بەجێدەهێڵێت.

. ئـەلێكترا: ئـەم چەمكـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەفسانەیەكی یۆنـانی كـە تیایدا باس لەچیرۆكی ئەلێكترای كچی (ئەجاممنون) دەكات ئـەم كچـە هـانی براكەی خۆی (ئۆریستیس) دەدات بـۆ كوشـتنی دایكـی خـۆی لەگـەڵ مـێردە تازەكـەی دایكیـدا، ئـەم مـێردە تازەیـە پێـش تـر دۆسـتی دایكـی بـووە، ئـەم هاندانەی ئـەلێكتراش تۆڵـە سـەندنەوەیە لـە بكوژانـی بـاوكی خـۆی كـەدیارە دایكیو مێردەكەی (واتا باوەپیارەكەی) بوون.

. كمـال، علـي (1986): الجنـس والنفـس في الحيــاة الانســانية، ط1، دار واسط، لندن، ص71.

. ئەم گرێیە لەقۆناغی ئۆدیبیدا دروست دەبێت كاتێك دایـك وبـاوك بەبەردەوامی هەڕەشەی بڕینی ئەندامی زاووزێ لەكوڕەكەیان دەكەن، فرۆید پـێی وایـە منـداڵ لـەقۆناغی ئۆدێبیـدا یـاری بـە ئـەندامی زاووزێی دەكــات وبەخـەیاڵ لەگـەڵ دایكیـدا ڕادەبوێرێـت وئـەو ئەندامـەی بـەكار دەهێنێـت. بەڕای فرۆیـد هـەمان گـرێ لـەلای منداڵـی كـچ هەیـە بـەڵام بەپێچەوانـەوەو بریتییە لەگرێی (نەبوونی ئەندامی نێرینەیی).

. هەمان سەرچاوەی ژماری (77) ل74

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل271

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل78

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل274-276

. سایکۆلۆژیای کۆمەلأیەتی ئەو لقەی سایکۆلۆژیایە کەتوێژینەوە لەسەر تاك وپەیوەندیەکانی بەگروپ وکۆمەڵەوە دەکات، یاخود بریتی‌یە لە توێژینەوەی زانستی بۆ ڕەفتاری تاکەکەس لەرێی پەیوەندی‌یەکانی بەکەسانی‌تری نێو گروپەکەیەوە، هەروەها کاریگەری ئەو پەیوەندیانە لەسەر هزرو بیری تاك ونەریت وهەست ونەست وهەڵچوون وڕەفتارو چەشنی وەلأمدانەوەکانی دەخاتە ڕوو. سایکۆلۆژیای کۆمەلأیەتی جیایە لەسایکۆلۆژیای گشتی کە هەوڵدەدات تاکەکەس بەدەر لەیاساکانی ژینگەی کۆمەلأیەتی بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەوە بەو مەبەستەی بەیاسا بنچینەیی‌یەکانی ڕەفتار بگات، ئەو یاسایانەی بەسەر هەموو مرۆڤێکدا دەچەسپێت وراستەو ناکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگەو گەشەپێکردنی کۆمەلأیەتی‌یەوە، بەلأم سایکۆلۆژیای کۆمەلأیەتی توێژینەوە بۆ تاکەکەس دەکات لەناوەندی هەڵوێستە کۆمەلأیەتی‌یەکان وکاریگەری ژینگەی کۆمەلأیەتی‌دا.

سایکۆلۆژیای کۆمەلأیەتی جیایە لە کۆمەڵناسی کەهەوڵ دەدات توێژینەوە لەسەر گروپ وکەمەڵگاو دیاردە کۆمەلأیەتی‌یەکان بکات بەبێ ڕەچاو کردنی تاکایەتی مرۆڤ، بەواتایەکی‌تر بەشێوەیەکی گشتی لە ژیانی کۆمەلأیەتی دەکۆڵێتەوەو، لەنێوان ئەو یاسایانادا ڕێکخستن ئەنجام دەدات کەیەکەکانی کۆمەڵ بەیەکەوە دەبەستێەوە. هەروەها دیاردەو ڕێکخراوە کۆمەلأیەتی‌یەکان بەیەکەوە گرێ دەدات تاکو بزانێت تاچەند کاریگەرییان

لەسـەر یـەکتری هەیـەو ئـەو کـارلێك کردنـەش تاچــەند شـوێنەواری خـۆی بەسەر ژیانی تاکەکانی کۆمەڵەوە بەجێدەهێڵێت.

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل130

. هەمان سەرچاوە، ل131-132

. هەمان سەرچاوە، ل133

. هەمان سەرچاوە، ل137

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (16) ل410

. هەمان سەرچاوەی ژماری (3) ل91

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل342-343

. هەمان سەرچاوەی ژماری (3) ل99-101

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل174

. هەمان سەرچاوە، ل176

. هەمان سەرچاوەی ژماری (3) ل98

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل308

. هەمان سەرچاوەی ژماری (3) ل88

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل311

. هەمان سەرچاوەی ژماری (1) ل88

. هەمان سەرچاوەی ژماری (22) ل314

. هەمان سەرچاوە، ل317

***************************

## سەرەتا

گەرچی بەندیخانە بە کۆنترین دامەزراوەی سزادان هەژمار دەکرێ، بەڵام مێژووی ئەم دامەزراوە لە دووسەدە تێناپەڕێت و پێشتر تاوانبار و گوناهباران لە نێو قەڵاو جێگا سەختەکاندا دادەنران و زیندانی دەکران.

ساڵی 1552 لە بەریتانیا یەکەمین دەزگای هاوشێوەی بەندیخانە دامەزرا بەناوی خانەی چاککردنەوە House of Gorrection بۆ ئەو کوناهبارانەی مەترسی یان کەم بوو، بەڵام ئەوانەی پڕ مەترسی و ترسناك بوون دەخزێنرانە نێو ژوورەکانی قوڵایی کەشتی و پاپۆڕەکانەوە یان ڕەوانەی ناوچە داگیرکراوەکانی ژێر دەستی بەریتانیا دەکران -بەتایبەتی ئوسترالیا-. ئەم ڕەفتارە سەرەکیترین شێوەی سزادان بووە، تاسەدەی هەژدەهەم و دەرکەوتن و سەرهەڵدانی زیندان لەبەریتانیاو وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیاتی ناردنیان بۆ مەنفا. بەندکراوەکان لەوسەدەمەدا لەماوەی زیندانی کردنیاندا هیچ جۆرە گرنگییەك بە کەسێتیو پێداویستییەکانیان نەدراوە (1).

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا کەنیسە بانگەشەی چاککردنی زیندانی دەست پێکرد و لە هەوڵی ئەوەدا بوو بکرێت بەخانەی چاککردن و سزادان،لەم پێناوەشدا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بەند کردن با تەنهایی (انفرادی) بێت بۆ جیاکردنەوەی تاوانباران لە یەکتری.

ساڵی 1803 لەڕۆما خانەی چاککردنی منداڵ و مێردمنداڵان دامەزراو لەساڵی 1835دا بەندیخانەی ژنان دامەزراو پاش ئەوەش لە باکورو باشوری

ئیتالیا چەندین بەندیخانە کرانەوە کەتەوەری کارەکانیان بریتی بوو لە چاککردنی تاوانباران.

## پەرەسەندنی سیستمی بەندیخانەکان لەسەردەمی نوێدا

پەرەسەندنی سیستمی بەندیخانەکان هاوشانە لەگەڵ پەرەسەندنی زانستی سزاداندا.دوای ئەوەی تیورە نوێیەکان بانگەشەی ئەوەیان دەست پێ کرد کە سنورێك بۆ دڵرەقی سزاکان دابنرێو بەستیانەوە بە ئامانجێکەوە کەبریتی بوو لە داکۆکی کۆمەلآیەتیو گرنگیدان بەکەسێتی حوکمدراوەکان، لێرەوە چاککردنی سیستمی بەندیخانەکان سەریان هەڵداو هاتنە ئاراوە.

لەمێژووی زانستی سزاداندا،چاککردنی بەندیخانەکان پەیوەستە بەبزوتنەوەی کیوکێرسەوە Quakers لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەهەریمی پەنسلڤانیا یاسای ساڵی 1782 دەرچوو کەکۆمەڵێك بیرۆکەی پێشکەوتخوازی لەخۆ گرتبوو وەك زەرورەتی جیاکردنەوەی مێرد منداڵ لە گەورەکان و، جیاکردنەوەی ژنان لەپیاوان و، گۆڕینی بەندیخانەکان بۆ شوێنی دابڕین وکارکردن (2).

لەپراکتیزەی ئەم هزرو بیرۆکەیەدا لەهەرێمی فیلادلیفیا بەندیخانەیەك دامەزراو تاوانکارە ترسناکەکانیان لە تاوانبارە ناترسناکەکان جیاکردەوە لەمەشدا پشتیان بە قەبارەی تاوانەکانیان بەستبوو، دەستەی یەکەم گۆشەگیرو دابڕاو دەکران بەبێ ئەوەی هیچ کاریکیان پێبکەن، بەلآم دەستەی دووەمیان بەکۆمەڵ خەریکی کارکردن بوون. ئەم دابڕینە تەواوەتی ورەهایەش بووە هۆی ڕووخاندنی دەروون وسایکۆلۆژیای بەند کراوەکەو دووری دەخستەوە لەپەشیمانی وتۆبەکردن جگەلەوەی تێچونێکی ماددی

زۆریشــی دەویســـت. ئـــەم دابڕینـــە تەواوەتیـــەش لەســـاڵی 1818- 1821 پەیڕەو کراوە.

دوابەدوای ئەمەش لەساڵی 1823دا سیستمێکی تر سەری هەڵدا کەئەویش کۆکۆدنەوەی بەندییەکان بـوو نـەك دابڕینیـان لەیـەکتری، کۆکردنەوەکـەش بـۆ نـان خـواردن وکـارکردن و بـەجێهێنانی سـروتە ئایینیـەکان بـوو بەمـەرجێك بێدەنگـی تـەواو بپـارێزن و، خوێنـدن ونووسـین وبەرنامـەی ڕاهێنان وئامادەکردنیان لێ زەوت کرابوو.

گەرچی ئەمە هەنگاوێك بوو بەرەو پێشەوە بەلاَم بێکەم وکورتی نـەبوو چونکە کارکردنی بـەندکراو و، بێدەنـگ بوونـی بەمەبەسـتی بەدەسـتهێنانی جۆرێك لەدەستکەوت وقازانج بوو، بەهیچ جۆرێك جیاوازی نێوانیان ڕەچاو نـەدەکرا کەئەمـەش بـووە هـۆی دارمـانی دەرونـی ورەوشـی کۆمەلاَیـەتی تاوانبـاران. بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەم حاڵەتـەش سیسـتمێکیتر سـەریهەڵدا کەبەسیستمی ئێرلـەندی یـان پلـەدار ناسـراوە. لـەم سیسـتمەدا بـەندکراو بەچەند هەنگاوێك بەرەو ئازاد کردن دەچێت ئەو هەنگاوانەش درێژخایـەن بوون بەم شێوەیە:-

قۆنـاغی دابڕینـی تـەواوەتی ـــــ◄ کـاری بەکۆمـەڵی ـــ◄ قۆنـاغی ئازادکردنی مەرجدار بەمەرجێك ئەوە بسـەلمێنرێت کـەڕەفتاری تاوانبارەکە ڕاست بۆتەوە وبەرەو چاك بوون هەنگاوی ناوە.

لەدوای ئەمەش چاککردنی مێردمندالاَن سەری هەڵدا، لەشاری نیویـورك سـاڵی 1825دا بۆیەکـــەم جـار خانـــەی چـاککردنی مـێرد منـــدالاَن بـــۆ دوومەبەست دامەزرا کەبریتی بوون لە:-

یەكەم: دوور خستنەوەی مێرد منداڵان لەتاوانبارە گەورەو كامڵەكان.

دووەم: فێركردنی پیشەیەك یان چاككردن وهەڵسەنگاندنیان.

لــە ســاڵانی 1904- 1935 دا پێشــكەوتنێكی مــەزن لەسیســتمی بەندیخانەكاندا ڕوویدا، ئەویش لابردن ونەهێشتنی سیستمی كاركردنی بێدەنگ وگۆڕینی بۆ سیستمی كاری دەستەجەمعی بوو، كەتیایدا بەندكراو بۆی هەبوو لەناوەوە ولەدەرەوەی بەندیخانە نامەگۆڕینەوە ئەنجام بدات و، كارگێڕی بەندیخانەش گرنگی بەفێركردن و ئامادەكردنی پیشەیی دەدا تالەڕووی كۆمەڵایەتیو دەروونییەوە ڕاست ببێتەوە وبەو مەبەستەی هاوسۆزی بگەڕێنێتەوە بۆ نێوان تاكەكەس وكۆمەڵگە.

ساڵی 1935 گۆڕانێكی جەوهەری ڕوویدا كەبریتیبوولە پۆلێن كردنی بەندكراوەكان بۆچەند بەشێك و، مامەڵەو ڕەفتاركردن لەگەڵیاندا بەشێوەیەك كەلەگەڵ هەرپۆلێكدا بگونجێت. جگە لەوەی پسپۆری هەمەجۆر هێنرانە نێو بەندیخانەكانەوەو تایبەت بوون بەلایەنی پزیشكیو دەروونیو كۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئایینیەوە (3).

## سزا لەسەردەمی كۆنەوە بۆ چەرخی نوێ

بنەمای سزادانان لەچەرخی كۆندا تاكایەتی بوو و، ئامانجی سزادانیش تۆڵە سەندنەوە بووە ئینجا ئەم تۆڵە سەندنەوەیە لەوانەیە بۆڕازی كردنی خواوەندەكان بو بێت یان بۆ كەفارەتی گوناهكردن یاخود تۆڵە كردنەوە بووە لەتاوانبارەكە. بۆیە دەكرێت بڵێین سزادان تاكگەرایی بووەو لەئامانجیشدا ئایینی بووە.

لەگەڵ گەشەسەندنی كۆمەڵگاكاندا ولەسەدەی شانزەهەمدا گۆڕانكاری بەرچاو بەسەر هزرو بیری كۆن وناوەندا هات و كۆمەڵگاش

لەدەرەبەگایەتی‌یـەوە گــۆڕا بــۆ ســەردەمی چــەند دەوڵــەتێکی بچـوك یــان دەوڵەتی گـەورە، لـێرەوە بیرۆکـەی دەسـەلاتی گشتی وبـەرژەوەندی گشــتی‌و رژێمـی گشـتی سـەریان هـەڵدا کەهـەمووویان لەبـەرژەوەندی کۆمـەڵدا بـوون‌و دەیانخســتە ســەروو بــەرژەوەندی تاکەکەســەوە، بۆیــە ســزاش لەبنـــەمای تاکایەتی‌یــەوە گــۆڕا بــۆ بنــەمای کۆمەلایــەتی وئامــانجی گشـتی وەرگــرت کەبریتی بوو لەقەلاچۆکردنی تاوان لەکۆمەڵدا (4).

## بنەمای سزادانان لەهزری نوێدا

لەسەدەی هەژدەهەمدا ئەوروپا لێشاوێك لـەهزری شۆڕشـگێڕی بـەخۆوە بینی کەسەرجەم لایەنەکانی ژیانی گرتەوەو ڕادەی ئـەو سـتەم وزۆرداریـە شاراوەیەی دەرخست کەلەسیستمی کۆمەڵایـەتیو ئـابوری وسیاسـیو یاسـایی ئـەو دەمانــەدا پیــادە دەکــران، نووســینی بیریــارە شۆڕشــگێڕەکانی وەك مونیسکیو و ڕۆسۆ و ڤۆلتێر، ڕێگا خۆشکەر بـوون بـۆ بـەرپابوونی شۆڕشـی فەرەنسا وچاوخشاندنەوە بەو بنەمایانەدا کەبونیاتی ئابوری وکۆمەڵایــەتیو یاسایی زۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەی لەسەر داڕێژرابوون.

ســەبارەت بەزانســتی تــاوان وســزادانیش چــەندین ڕێبــازو پرۆگرامــی هەمەجۆر سەریان هەڵدا بەڵام سەرەتای زانسـتیی ئـەو ڕێبازانـە پەیوەسـتە بەنوسـراوەکانی زانـای ئیتـالی ((ســیزاری بیکــاریێ 1764)) کەپاشــان بــوون بەبنــەمای تیــوری قوتابخانــەی ڕۆتینــی - التقلیدیــە- لەسیاســەتی ســزاو سزادانـدا (5).

سەبارەت بەسیاسەتی سزادان سێ قوتابخانــەی ســەرەکی ســەریان هــەڵداو بریتین لە:-

### یەکەم : قوتابخانەی ڕۆتینی:

بنـەماکانی قوتابخانـەی رۆتینــی کــەبیکاریێ دایڕشــت وای بــۆ دەچێـت ڕێبازی چێژو لەزرەتی دەروونی بنەمایە بۆ ڕەفتـاری تاکەکـەس. هـەرتاکێك بەرلەئـەوەی ڕەفتـارێك بکات ئـەو لـەززەت وئـازارە مـەزەندە دەکات ورێــك دەخات کەبەهۆی ڕەفتارەکەیەوە ڕوبەڕووی دەبێتەوە (6).

نـاوەڕۆکی ئـەم تیـورە بەجۆرێکـە کـە کاردانـەوە بـۆ تـاوانێك پێویسـتە بڕێکی دیاری کراو ئـازار لـەخۆبگرێت بـۆ تاوانبارەکـەو پـێیـان وایـە دەبێـت ڕەفتـارە نەشـیاو نالـەبارەکانی مـرۆڤ بەسـزادان و ئێـش وئـازار وەلأم بدرێتەوەو بڕی ئازارەکەش بەشێوەیەکی ڕوون وئاشکرا دیـاری بکرێـت تـاکو تاوانبارەکـە بەتـەواوەتی لەبـەر چاویدا بێـت وزیـاتر بێـت لـەو لەززەتـەی کەلەکردەوەیەکی تاوانباری‌یەوە تاوانبار دەستی دەکەوێت (7).

بـەلای بیکاریێ‌وە بنـەمای دەسـەلأت لەسـزاداندا لەئەسـتۆی دەوڵەتدایـە ئـەویش بـەپـێی پـەیمانێکی کۆمەلأیـەتی کەلـەنێوان تاکەکەسـان ودەوڵـەتدا دەبەسـترێت بـەجۆرێك تاکەکەسـان واز لـەبڕێك ئـازادی خۆیـان بـهێنن تالەبەرامبەردا ئارامی‌و ئاسایشیان دەست بکەوێت، هەرشـتێك کەتاکەکەسـان وازی لێ دێنن لـەپێناو مـافی بـەرگری کـردن لەسـەرو ماڵیـان، دەچێتـە سـەر بودجەی دەوڵەت، بۆئەوەی داکۆکیـان لێ بکـات بەقـەد ئـەو بـڕەی کەداویانـە بەدەوڵەت. بەدەر لەم سنورو پەیمان بەستنە هیچ شتێك ناکرێت وهیـچ داد پەروەرییەك بەرقەرار نابێت.

ئینجـا بـۆ زامـن کردنـی وابەسـتەیی دەسـەلأت بەوپەیمانـە کۆمەلأیەتی‌یـەوە، بیکـاریێ بانگەشـەی جیاکردنـەوەی دەسـەلأتەکان دەکـات، واتـا جیاکردنـەوەی دەسـەلأتی جێبـەجێکردن لـە دەسـەلأتی یاسـادانان و دەسەلأتی قەزائی، چونکە ئەگەر هەرسێ دەسەلأتەکە لەدەستی یەك کەسـدا بێت ئەوا ستەم وزۆرداری لێدەکەوێتـەوە. بـەلأم ئەگـەر جیابکرێنـەوە ئـەوا هاوسـەنگی لـەنێوان ئـەرکی هەرسـێکیاندا بەرقـەرار دەبـێ وهـەر یـەکێکیان دەبێتە چاودێر بەسـەر ئـەوی تریانـەوە، ئەمـەش گـەورەترین گرنتی‌یـە بـۆ پاراستنی ماف وئازادی تاکەکەسان (8).

لەدیدو بۆچوون وتێڕوانینەکانی بیکاریێ‌وە ئەم ئەنجامانە کەوتنەوە:

1-بناغـەی سـزاو سـزادانان لـەلای یاسـادانانە (التشـریع) ودادوەر دەبێـت لەسـنوری ئەرکەکـەی خۆیـدا ئـەو سـزایانە جێبـەجێ بکـات کەدەسـەلأتی یاسادانان لەپێش ئەودا دایڕشـتوون، واتـا یاسـادانان جێگـای ئـایینی گرتـەوە بوو بەبناغەی هەموو یاسایەکی سزادانان وای لێهات هەموو سزایەك دەبێـت دەقێکی یاسایی دەستنیشانی بکات ودیاری کردبێت.

2- ئامـانجی سـزادانیش پێویسـتە لەبـەرژەوەندی کۆمەڵـە کەسـاندا بێـت، بەرژەوەندی کۆمەڵیش بەسزای توندو تیژ دەستەبەر ناکرێت، بەڵکو دەبێت پێوەرێکی بابەتی هەبێت بۆ ئەومەبەستەو نابێت تەماشـای تاوانبـار وڕادەی مەترسـیيەکەی بکات بـەلکو لەڕوانگەیـەکی تـرەوە تەماشا بکرێـت ئـەویش بەوەی تاچەند تاوانەکەی زیانی بەکۆمەڵ گەیاندووە.

لـەم ڕووەوە بەسـتنەوەی سـزا بەتاوانـەوە بەئـەرك وزەرورەت دانـرا کەپێویستە سزا بەتاوانـەوە ببسـترێتەوە نـەك بـەتاوانبارەوە، ئـەم سـزایەش نابێت تۆڵەکردنەوە لەتاوانبار یاخود ئەشکەنجەدان بێت، بەڵکو دەبێـت سـزا ببێتە لەمپەرێك بۆ ئـەوەی تاوانبـار تـاوانی تـازەتر نەکاتـەوەو تـەمێ بێـت، بەواتایـەکی تـر ئـەرکی سـزادان دروسـت کردنـی لەمپـەرو ڕێگـرە: لەمپـەری تایبـەتی (بـۆ تاوانبـار) ولەمپـەری گشـتی (بـۆ تـەواوی تاکەکەسـان)ئەمـەش کاتێك بەدی دێت کەئازاری سـزادانەکە گـەورەتر بێـت لـەوچێژو لەززەتـەی کەتاوانبار لەتاوانەکەیەوە پێی بڕاوە.

3- بیکارییێ جەخت لەسەر بیرۆکەی ئازادی ئیرادە ولێپرسراوێتی ئەدەبی تاوانبار، دەکاتەوە، چونکە پێی وایە تاوانبار دڕندەو کافرو مرۆڤی نەخۆش نیـە بـەڵکو مرۆڤێکە بەهۆشـیاری خۆیـەوە سـەرپێچی کـردووە لـە پـەیمانی کۆمەلأیەتی، مرۆڤێکی ساغ ودروستەو بـەخراپی ئـازادی خـۆی بـەکارهێناوە بۆیـە بەرپرسـە لـەکردەوەکانی. بـەلأم ئەگـەر تاکەکـەس ئـیرادەی لەدەسـت

دابێ وتوانای جیاکردنەوەی نەبێت لەم حاڵەتەدا لێپرسراوێتیش لەدەست دەدات وهیچ سزایەك بۆ شێت وبچوك و کاڵفام نییە.

## هەڵسەنگاندنی ئەم تیورە

گەرچی ئەو بیرو باوەڕانەی کەئەم تیورە خولقاندنی بە شۆڕشێك لەبواری سزاو سزادانندا دادەنرێن بەلاَم بێکەم وکورتی نەبوون، بۆیە ئەم ڕەخنانەیان ئاراستە کراو لێرەدا ئاماژەیان بۆ دەکەین:-

1- ئەم تیورە بەرەوتێکی فەلسەفی دابڕاودا ڕۆشتوە وجەخت لەسەر (کردەوە) دەکات و (بکەر) ی فەرامۆش کردووە، سزای مەزەندە کردوە بۆ تاوان بەبێ ڕەچاوکردنی تاوانبار ئەمەش وای لێکردووە ئەو گریمانە بکات کەتاوانبار، یان لێپرسراوی یەکەمی تاوانەکەیەتی یاخود هیچ لێپرسراوێتی‌یەکی لەئەستۆدا نییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆڤ یان هۆشیاری‌و ئیرادەی هەیە یان بەهیچ جۆرێك نییەتی. هیچ بوارێك لەنێو ئەو دوو ڕادەیەدا نییەو، دەکرێت بلێین سەدان وهەزاران مرۆڤ شوێن وجێگایان دەکەوێتە نێوان ئەو دوو جەمسەرەوە.

2-هەموو تاوانێکی بەسزایەکی دیاری کراوەوە بەستۆتەوە و، دادوەر بۆی نییە هیچ دەستکاریەك بکات، یان ئەوەتا هەموو سزاکە دەسەپێنێت یان بەرزی دەکاتەووە ونایدات بەسەرتاوانباردا ئەمەش بەناوی یەکسانی‌یەوە خۆی لەخۆیدا ستەمێکی گەورەیە. هیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت مرۆڤەکان لەپێکهاتندا وەك و یەك ویەکسانن، خۆئەگەر کردەوەکان وەك یەك بوون ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ناوەڕۆك وبنچینەشیان وەکو یەك وایە (9).

**دووەم : قوتابخانەی ڕۆتینی نوێ**

دوابەدوای ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی تیوری ڕۆتینی کران، هەندێك لەپسپۆڕانی تایبەتمەند هەوڵیانداوە چارەسەری ئەو ڕەخنانە بکەن. ئەگەر لەپێشدا سزا لەسەر بنەمای هزرو بیرۆکەی ڕەها بوو وەك دادپەروەری ویەکسانی، ئەوا یەکەمین چاکسازی کە بانگەشەی بۆکرا بریتیبوو لە نزیك کردنەوەی ئەوبیرۆکەیە لەواقیع یان بەشێوەیەکی ڕێژەیی تەماشا بکرێت، واتە لەکەسێکەوە بۆکەسێکیتر بگۆڕێت و لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکیتر گۆڕانی بەسەردا بێت. بەم جۆرە ئامانجی سزا -لەڕوانگەی ئەم قوتابخانە نوێیەوە- لەجیاتی یەك ئامانج بوو بە دوو ئامانج و بریتی بوون لەهێنانەدی دادپەروەریو، پارێزگاری کردن لەسیستمی کۆمەڵایەتی(10).

کەواتە بناغەی سزا بریتی بوو لەهێنانەدی چاودێری وپاراستنی (قانونی) مافەکان لەکۆمەڵگەدا، واتە گێڕانەوەی ئەو سیستمەی کەبەهۆی تاوانەکەوە شێوێنراوە نەك چاککردنەوەی تاوانبار، چونکە چاککردنی تاوانبار پرۆسەیەکەو لەبازنەو سنوری یاسایی تاوانکردن دەردەچێت و لەگەڵ سزادانیدا یەکناگرێتەوە. لەبەر ئەوەی ئامانجی چاککردن پاکژکردنەوەو بەهێزکردن و ڕۆشنبیرکردنی تاوانبارە، واتە خێرو چاکەیە بۆ تاوانبار، بەلام ئامانجی سزادان ئازار دان و سەپاندنی شەڕە بەسەر تاوانباردا. بەم جۆرە ئاشکرایە ئامانجی سزاو ئامانجی چاککردن یەکناگرنەوە و لەمل ملانێدان. بۆیە دەبێت ئەو ئازارەی کەتاوانبار بەهۆی سزاکەیەوە وەریدەگرێت بەهێندەی ئەو کەڵك وسودە دەبێت کەکۆمەڵگا بەهۆی سزادانی تاوانبارەوە دەستی دەکەوێت، ئەمەش ئەوکاتە دێتە دی

کەسزاکە گونجاوو هاوشانی ڕادەی لێپرسراوێتی تاوانبارەکە بێت لەوتاوانەدا کەکردوویەتیو، تاچەند پەی بردنی هەیە وخاوەنی ئیرادەیەو توانای هەڵبژاردن لەدەستی خۆیدایە(11).

بەم جۆرە ئەم قوتابخانەیە گەشتە ئەو بڕیارەی کەسزادان دەبێت نەرم ونیانی لەخۆ گرتبێ ولەونێوان هەردوو جەمسەرەکەدا بێت (ئیرادەی تەواو وبێ ئیرادەیی)

## کاریگەری قوتابخانەی ڕۆتینی نویٚ لەسەر یاساو تەشریعەکانی تاوان

ئەوەی ئەم قوتابخانەیە، دۆزییەوەو ڕوونی کردەوە، پشت بەستن بەوەی کەتاوانبار لە باروزروفێکی تایبەتیدا بووە کەتاوانەکەی لەسایەیدا ئەنجام داوە، بۆیە بانگەشەی ئەوەیان کرد کەچاوێك بخشێنرێتەوە بەسەر مانای دادپەروەریدا -لەسزا داندا-.

پیٚیان وابوو کەدادپەروەری بەوشێوەیە نایەتە دی کە یەکسانی هەبێت لەنێوان کردەوەو کردەوەو، کەسێك وکەسێکی تردا، بەڵکو بەوە دێتە دی کەیەکسانی لەسزادا هەبێت بەمەرجێك بارو زرووفەکان یەکسان بن، لێرەوە ئیتر سزا بۆ تاوانەکان یەك سزا نەبوو بەڵکو لەنێوان کەمترین ڕادەو بەرزترین ڕادەدا بوو، ئەمەوجگە لەوەی کە بارو زروفەکانی هەرتاوانێك بەجیا ڕەچاو دەکراو، دادوەریش دەسەلاتێکی نەرمی هەبوو کەدەیتوانی بەپیٚی باری هەرتاوانێك سزاکەی بگۆڕێت، سوکی بکات یان سزاکە قورس بکات(12).

## سێیەم: قوتابخانەی واقیعی

قوتابخانەی واقیعی دەنگدانەوەی ئەو ڕەوتە زانستیە بوو کەلەسەدەی نۆزدەهەمدا باڵی بەسەر تیوری یاسادا کێشابوو، دوای ئەوەی بڕوا بەزانست هێنراو پشت بەمیتۆدی ئەزموونگەری بەسترا. بەلای لایەنگرانی ئەم ڕێبازەوە بناغەی سزادان هەمە جۆرەو دەگۆڕێت، هەربەتەنها تۆڵەکردنەوەی تاکێتی تایبەتی یان گشتی نییە یاخود بەناوی بەرژەوەندی ودادپەروەریەوە دروستکردنی ڕێگر ولەمپەر نییە، بەڵکو بەتەنها بریتییە لە: بەرگری کردن لەکۆمەڵگا. هەرڕەفتارێك مەترسیدار بێت ئەشێت لەداهاتوودا تاوان بەرهەم بهێنێت، ئەمەش ڕووداوێکی کۆمەلأیەتی ترسناکە وپێویستە ڕێی لێبگیرێت. بۆیە جەخت لەسەر ڕێوشوێنی خۆپاراستن دەکەنەوەو دەبێت هەوڵەکان بەو ئاقارەدا بڕۆن وبەرەنگاری ئەو فاکتەرانە ببنەوە کە ڕێخۆشکەرن بۆسەرهەڵدانی دیاردەی تاوان. کەواتە دەبێت قەلأچۆی ئەو هۆکارانە بکرێن کە هەوێنن بۆدروستکردنی تاوان وەك حاڵەتەکانی: بێکاریو بێسەرپەرشتیو سەرخۆشیو نائومێدیو نەزانیو نەخوێندەواریو پەروەردەی خراپ وتێکەلأوی لەگەڵ خراپ وبەدڕەفتارەکاندا، ئەمانەو جگەلە فاکتەرە سروشتیو جوگرافیەکان کەهەموویان بەیەکەوە تاوان دەخولقێنن. ئینجا ئەگەر ئەو فاکتەرانە یەکیان گرت وڕەوشەکەش لەباربوو ئەوا کەسەکە ناچار دەکەن مل بەرەوتاوان بنێت، ئەمەش ئەو مانایە دەگەیەنێت کە تاکەکەس لێپرسراوی تاوانەکەی نییە چونکە ناچارە بەکردنی تاوان وهەردەبێت بیکات و وەك ئامێروایە بەدەست باروزروفی وڕەوشەکەیەوە(13).

ڕێو شـوێنی خۆپاراسـتن لـەتاوان بـۆ حاڵەتـە تاکیـەکان بریتیـە لەڕووبەڕووبونەوەی مرۆڤە مەترسیدارەکە بەرلەوەی تاوانێك ئەنجام بدات. یان لەپاش ڕوودانی تاوان کەبە ڕێو شوێنی ئاسایش ناودەبرێت بۆ لەڕیشە هەڵکێشـانی یـەکجارەکی وەك لەسـێدارەدان یـان دابریـن و بـەند کردنـی هەتاهەتایی، یان چارەسەرکردن وەك ئەوەی لە نەخۆشخانەی عـەقڵی داغـڵ بکرێ بۆچارەسەر کردن، یان کۆمەڵایەتین ئـەویش بـەزۆر نیشـتەجێ کـردن یان ناچارکردن بەئیش کردن دەگرێتەوە.

## کاریگەری ئەم ڕێبازە لەبواری یاساکانی سزادا

بـەهۆی هـزرو بیرەکـانی ئـەم ڕێبـازەوە گۆڕانکـاری گـەورە لەزۆربـەی یاساکانی سزاداندا لەگەلێك ولاتی وەك بەلجیکا، ئەڵمانیا، نەمسا، بـەریتانیا، ئیتالیـا هاتنـە ئـاراوە لەسـەر بنـەمای بیرۆکـەی خۆپاراسـتن، ئـەویش بەگرتنەبـەری ڕێگـا بـۆ توێژینـەوە لـەدیاردەی تـاوان بەشـێوەیەکی زانسـتی وئەزموونگـەری وپشـکنینی مـرۆڤ لـەڕووی نەخۆشـی ولادان (پزیشـکیو دەروونـی وعـەقڵی) پێش دادگـایی کـردن، بـەلاّم لـەدوای ڕوودانـی تـاوان، ڕێوشوێنی نوێ لەسزاداندا گیرانەبەر وەك لێبوردن و، هەڵپەساردنی سـزاو، ئـازادکردنی مـەرجدارو، سـپاردن بەشـوێنی تایبـەت بۆماوەیـەکی دیـاری نەکراو(14).

## لەنێوان ڕێبازی ڕۆتینیو واقیعیدا

ڕێبازی ڕۆتینی (کۆن ونوێ) ڕەفتاری تاوانکارییان ئەگەڕاندەوە بۆتاوان وتاوانباریشیان پشت گوێ خستبوو، وەك تاوانبار تەماشایان دەکرد وسزایان بەسەردا دەسەپاند، لەمەبەرامبەریشدا ڕێبازی واقیعی دیاردەی تاوانکاری دەگەڕاندەوە بۆ تاوانبارو بەبێ گوێدانە تاوانەکە و، بڕی ئەو زیانەی بەهۆی تاوانەکەوە ڕوویدەدا، لەم نێوەشدا تیمی سێیەم سەریان هەڵدا و لەهەوڵداندا بوون بۆ کۆکردنەوەی لایەنی باش و پۆزەتیفی هەردوو ڕێبازەکە لەچوارچێوەیەکی تیوریدا کەگرنگی (تاوانبار- تاوان) وڕۆڵیان فەرامۆش نەکرێت و، لێپرسراوێتی تاوان لەسەر بنەمای (مەترسی تاوانکردن) بۆ (تاوانبار و هەڵە لەتاوانکردندا) ڕەچاوبکات. و لەسیستمی سزاداناندا هەردووکیان (سزاو ڕێ وشوێنی خۆپاراستن) کۆبکرێنەوە(15).

## تیوری گراماتیکا (بزوتنەوەی داکۆکی کۆمەڵایەتی)

بزوتنەوەی داکۆکی کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە بۆ پرۆفیسۆر فیلیپۆ گراماتیکا، میتۆدی ئەم بزوتنەوەیە بریتی‌یە لە هەڵوەشاندنەوەی یاسای سزاکان و دانانی یاسایەکی تر لەجێگای ئەویش یاسای داکۆکی کردنی کۆمەڵایەتی‌یە و گراماتیکا لەساڵی 1947دا تیۆرەکەی لەکتێبی (بنەماکانی داکۆکی کۆمەڵایەتی)دا بڵاوکردۆتەوە.

ئەم پسپۆرە بەتەواوی یاساکانی سزاو هزرو بیرەکانی پشت یاساکانی تاوانبارکردن هەڵدەوەشێنێتەوەو، باوەڕی نییە بەچەمکەکانی تاوان وتاوانبارو لێپرسراوێتی تاوان وسزای تاوان، بەوشێوەیەی کەمانای بۆ دانراوەو ڕێککەوتنی لەسەرکراوە. بەڵکو باوەڕی بەبازنەیەکی فراوانتر هەیە کەلەوانە زۆر بەرین ترەو دەڵێت:

- کردەوەی دژ بەکۆمەڵگا یان ڕەفتاری ناکۆمەڵایەتی لەجیاتی تاوان.
- لەجیاتی تاوانبار دەڵێت مرۆڤی خاوەن ڕەفتاری ناکۆمەڵایەتی.
- لەجیاتی لێپرسراوێتی تاوان قسە لەسەر چاککردن دەکات بەشێوەیەك کە سەرلەنوێ مرۆڤەکە ڕابهێنرێتەوە ودووبارە لەڕوی کۆمەڵایەتی‌یەوە لەگەڵ کۆمەڵگادا خۆی بگونجێنێتەوە.
- لەجیاتی سزا دەڵێت: سەرلەنوێ ڕاهاتنەوەی تاکەکەسی دژ بەکۆمەڵگا ئەمەش بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی کۆمەڵایەتی پێویست بەپشت

بەستن بەتوێژینەوەی زانستی ئەزموونگەری بەربلاّوو گشتگیر. بەیەکێ لـەم ڕێگایانە:

- نــەخۆش دەبێــت لــەڕووی دەروونــی وپزیشــکیيەوە چارەســەری بۆبکرێت.
- نەزان دەبێت ڕۆشنبیر بکرێت وفێری خوێندەواری بکرێت.
- بێکار دەبێت فێری کارکردن بکرێو کاری بۆ بدۆزرێتەوە.
- نائاسایی (شاز) دەبێت هەلبّسەنگێنرێت وڕاست بکرێتەوە.
- گەندەلّ وبەد دەبێت دابڕو گۆشەگیر بکرێن.

ئەم ڕێوشوێنە کۆمەلاّیەتیانە -کە ئامانجیان چاککردنە- پێویست ناکات بەمادەیەکەی یاسایيیەوە سنوردار بکرێن، بەلّکو دەشێت لـەپێش یـان لەپاش ڕوودانی کردەوە تاوانباریيەکەدا بگیرێنە بەر(16).

ئەم ڕێوشوێنە کۆمەلاّیەتیانە پەیوەندیان بەسزاوەنیە بەلّکو بۆ ئاسایش و هێمنـین و دەبێـت لەهــەموو شـوێن و جێگایــەکدا -جگەلــە بەندیخانــە- پراکتــیزە بکرێــن ودەکرێــت وەك نەخۆشــی هــەژمار بکرێــن، وەك چــۆن نەخۆشـی عـەقلّ یـان گـەدە چارەسـەری خـۆی بۆدەکرێـت، ئـەم حالّەتانــەش نەخۆشـین و بەنەخۆشـی کۆمەلاّیـەتی دادەنرێــن وبریتــین لەنــەگونجاندنی کۆمەلاّیـەتی. بــەم پێیــە چــاککردنی کۆمەلاّیــەتی تەنــها بەگرتنەبــەری ڕێوشـوێنی کۆمەلاّیـەتی دەسـتەبەر نــاکرێت بــەلّکو پێویسـتی بەسیاسـەتی کۆمەلاّیــەتی گشــتگیر هەیــە کەسیســتمی خــێزان و ئــابوریو ڕۆشــنبیریو چاودێری تەندروستی دەگرێتەوە(17).

## ناساندنی زانستی سزادان

ئاشــكرایه تاوانناســی بــەمانا بەرفراوانەكــەی بریتیــە لــەو زانســتەی لەفاكتەرەكانی پێكهێنانی دیاردەی تاوان لای تاكەكەس وگروپەكان دەكۆڵێتـەوەو، سـەرەڕای گرتنەبـەری ڕێگای كاریگەر بـۆ ڕوو بەڕوبونـەوەی تـاوان. بـەم مانایـە زانســتی تــاوان چــەندین زانســتی ترلــەخۆ دەگرێــت كــەلای خۆیانــەوە لەگۆشەیەكەوە لەدیاردەی تـاوان دەكۆڵنـەوە وەك زانستی سروشـت ونیشـانەكانی تاوانبـار و، سـایكۆلۆژیای تـاوان و، سوسـیولۆژیای تـاوان وزانسـتی سیاسـەتی تـاوان وزانستی سزادان. لەم ڕووەوە ئاماژە بەزانستی سزادان دەكەین:-

### پێناسەی زانستی سزادان:

یەكێكـە لـە لقـەكانی زانسـتی تـاوان كەلـە -ڕووبەڕووبونـەوەی- دیـاردەی تاوان دەكۆڵێتەوە ئەویش لـەڕێی سـەپاندنی سـزا بەسـەرتاوان وگرتنەبـەری شێوازی درووست بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ تاوانباردا(18).

### زانستی سزادان ویاسای سزاكان:

زانسـتی سـزادان بریتیــە لەكۆمــەڵێك ڕێوشــوێن وبنــەمای گشــتی كەبەهۆیانــەوە دەشــێت ڕوبــەڕوی دیــاردەی تــاوان ببینــەوە بەشــێوەیەكی كاریگەر ئـەویش بەگرتنەبەرو هەڵبژاردنی باشـترین شـیواز بۆدیـاری كردنـی سـزاو دیـاری كردنـی شـێوازی مامەڵەكردن لەگـەڵ تاوانبــاردا بــەلام یاسـای سزاكان بریتی‌یە لەهەندێ بنەما كەتاوانەكان وسزاكان دەستنیشان دەكەن.

لێرەوە دەردەکەوێت کەجیاوازی لەنێوان هەردوکیاندا هەیە بەوەی کەیاسای سزاکان بریتییە لە کۆمەڵێ بنەمای یاسایی کەتاوانبار وسزاکان دیاری دەکات، بەلاّم زانستی سزادان بریتییە لەکۆمەڵی ڕێوشوێن وبنەما کەبەهۆیانەوە یاسادانەر سزاکەی دادەڕێژێ وشێوازی جیٚبەجیٚکردنەکەشی دەستنیشان دەکات(19).

کەواتە زانستی سزادان قانون نییە بەڵکو زانستی ڕاڤەکردنی ئەزمونگەرییە ولە ڕێوشوێنەکانی سزادان وشێوازی جیٚبەجیٚکردنی دەکۆڵێتەوە، بەلاّم یاسای سزاکان سەرچاوەیەکی ڕەسمی هەیە بۆ گرتنەبەری سزادان وڕێوشوێنەکان، بەلاّم سەرچاوەی زانستی سزاکان فراوانترە ونیشتمانیو ناوچەیی ونێونەتەوەیش دەگرێتەوە.

## خەسڵەتەکانی سزاکان

سزای تاوانبار پێویستە ئەم چوار بنەمایە لەخۆ بگرێت:-

- **بنەمای شەرعیەتی سزا**:

ئەم بنەمایە لەسەر ئەو سەرچاوە دەستورىیە گرنگە داڕێژراوە کەدەڵێت: تاوان وسزا دەبێت لەسەر بناغەی دەقی یاسایی دەستنیشان بکرێن. ونابێت هیچ کردەوەیە بەتاوان دابنرێت ئەگەر دەقێکی یاسایی نەبێت- وەك جۆرو بڕی تاوان- دیاری نەکات. ئەم بنەمایە زۆربەی زۆری دەستورو یاسا هاوچەرخەکان بڕیاڕیان لەسەرداوەو بەرئەنجامی تێکۆشانی مرۆڤایەتییە دژ بەزۆرداری و ستەمی دادوەرەکان بەپێی هەوەسو ئارەزووی خۆیان تاوان وسزایان دیاری کردوە، بەپێی ئەم بنەمایە ڕۆڵی

دادوەر تەنـها جێبــەجێکردنی ئــەو ســزایەیە کــەدەقێکی یاســایی بڕیــاری لەسەر داوە(20).

- **بنەمای قەزائی سزا**:

مەبەستی ئــەم بنەمایــە ئەوەیــە کەتەنــها دەســەلأتی قــەزائی بــۆی هەیــە وتایبەتمــەندە بــەئیمزاکردنی سـزای تاوانەکانــەوە. ئــەم بنەمایـــە بەشــێوەی ڕێك وپێك لەمادەی (459) ی یاسای ڕێوشوێنەکان دیاری کـراوە کەدەقەکـەی دەڵێت: نابێت ئیمزای هیچ سزایەك بکرێت کە بەپێی قانون بڕیاڕی لەسەر دراوە تەنـها بــەپێی ئـەو بڕیـارە نــەبێت کـەدادگای تایبـــەت بــەوکارە پـــێی هەڵدەســتێت. بــەم جــۆرە ئەگـەر گومـانلێکراویش دان بەتاوانەکـەیدا بنێــت ئــەوا دەســەلأتی پۆلیـس ودادوەری گشـتی بۆیـان نـیـە هیـچ ســزایەکی نێــو یاسای سزاکان بەسەر ئەو کەسەدا بــدەن بــەڵکو دەبێـت بــەرزی بکەنــەوە بـۆ دەســــەلأتی قـــەزائی تابڕیــاری لەســـەر بـــدات بـــەدیاری کردنـــی جـــۆرو بڕەکەی(21).

- **بنەمای کەسێتی سزا**:

بنەمایــەکی ســەرەکییە لەیاســاکانی ســزادا ودەڵێـت: تەنــها ئــەو کەســـەی حوکمـی بەسـەردا دراوە دەبێـت سـزاکە بچێژێــت و وەربگرێــت نــەك هیــچ کەسێکی تر -دوور یان یان نزیك- لەم بنەمایـەدا هـاتووە: ئەگـەر کەسـەکە - لـەپێش دەرکردنـی حوکمـدا- بمرێـت ئـەوا داوانامەکـە دەسـوتێت، خۆئەگـەر لەدوای دەرکردنی حوکم وپێش جێبـەجێکردنی حوکمـدا کەسـەکە بمرێـت ئـەوا داوانامەکـە بـەتاڵ دەبێتـەوە. بـەلأم ئەگــەر لــەکاتی جێبــەجێکردندا بمرێت ئەوا سزاکە دەوەستێت.

- **بنەمای تاکێتی سزا**:

بەپێی ئەم بنەمایە سزا چەسپاو ونەگۆڕنییە بەڵکو لەنێوان کەمترین ڕادەو زۆرترین ڕادەدا لەگۆڕاندایە، چونکە تاوانەکان بەپێی قورسیو باروزروفی ئەنجامدانیان جیاوازییان لەنێواندا هەیە. ڕەنگە دووکەس یەك تاوان ئەنجام بدەن، بەلاّم سزاکەیان وەك یەك نەبێت بەپێی گەورەیی هەڵەکانیان گۆڕانی بەسەردا بێت هەروەها بەپێی ڕۆڵ و مەترسی هەریەکێکیان سزاکەش دەگۆڕێت(22)، (23)، (24).

**جۆرەکانی سزاکان**:

جەوهەری سزادان - سزای تاوان لەڕووی یاساییەوە- بریتییە لەئازار چەشتن بەلاّم ئەم ئازارە تەنها هەست کردن نییە بەئێش وئازارو ژان، بەڵکو مەبەست لێی زیانە، زیان لەمافەجەوهەرییەکانی تاوانبار، لەسەر ئەم بناغەیە سزا بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش دەکرێت:

أ- **سزای جەستەیی**:

لەسێدارەدان: بەکۆنترین سزا دادەنرێت وهەتا ئەمڕۆش پەیڕەو دەکرێت گەرچی هەندێ وولاّت بەسەر تاوانباردا نایسەپێنن وەك سویسرا ( 1947 ) وئەڵمانیا( 1937)و ئیسپانیاو ڕوسیاو هەندێ ویلایەتی ئەمریکاو.. تاد. ئەم سزایە توندترین سزایە چونکە مافی ژیان لەتاوانبار دەسەنێتەوە(25).

لەنێوان پسپۆرو شارەزایاندا ناکۆکی زۆر هەیە سەبارەت بەسەپاندن و نەسەپاندنی سزای لەسێدارەدان، ئەوانەی لەگەڵ سەپاندنیدان پێیان وایە

کاریگەرترین سزایە بۆ نەهێشتنی مەترسی لەسەر سیستمی کۆمەڵایەتی و تاقە ڕێگایەکە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی تاوانی ترسناك وتاوانکاری پڕ مەترسی کەمەسەلەی چاککردن هیچ سودێکی لێ نەکەوێتەوە لەگەڵیاندا. بەلاّم ئەوانەی لەگەڵ سەپاندنی سزای لەسێدارەداندا نین بەسزایەکی ناشەرعی دادەنێن چونکە هەموو دەروازەیەك لەبەردەمی چاککردنی تاوانباردا دادەخات کەئەمەش دژ بە ئامانجەکانی سزای تاوانە لەسیستمی کۆمەڵایەتی‌یدا، وهیچ سودێك بەتاك ناگەیەنێت چونکە چاککردنی تێدانی‌یە، هەروەها بەکۆمەڵیش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بەرهەم، دوای ئەوەی کارکردن لەبەندیخانەکاندا بوو بەهۆیەك بۆزیادکردنی بەرهەم لەکۆمەڵگەدا، ڕەنگە لەپاش جێبەجێکردنی دەربکەوێت کەتاوانبار بێگوناهەو لەم حاڵەتەدا بەگەورەترین هەڵە دەژمێردرێت کە دەسەلاّتی قەزائی پیّی هەڵساوە(26)، (27).

## ب-سزای زەوت کردنی ئازادی:

ئەو سزایانە دەگرێتەوە کەمافی ئازادی مرۆڤ زەوت دەکات بەوەی تاوانبار بەدەزگا سزایی‌یەکانی وەك بەندیخانە دەسپێرێت. بۆ نموونە: کاری قورس یان بەندکردن. کۆت و بەندکردنی ئازادی ڕوخسارێکی سەرەکی سیستمی سزاکانە بەلاّم هەردەم لەوێنەی سزادا تەماشا ناکرێت بەڵکو وەك ڕێوشوێنی خۆپاراستن تەماشا دەکرێو دێتە هەژمارکردن ولەم وێنانەدا دەردەکەوێت: خستنە ژێرچاودێری پۆلیسەوە، دورخستنەوە وسەپاندنی نیشتەجێکردن لەشوێنێکی دیاریکراودا. ڕەنگە لەپێش حوکم داندا ئەنجام بدرێت وەك بەندکردنی یەدەکی ئەمەش کەرەسەیەکە بۆ خۆپاراستن لەترسی هەلاّتنی تاوانبارکراو(28).

سەبارەت بە هەمەجۆریو یەکخستنی ئەم سزایە مشتومڕێکی زۆر هەیە، هەندێك دەڵێن بەپێی گەورەییو قورسی تاوانەکە باسزاکەش هەمەجۆر بێت، بەلاَم ئەوانەی دەڵێن با یەك سزابێت بەلاَم جیاوازیەکە لەماوەی بەند کردنەکەدا بێت، ئەم دەستەیەی دووەم پشت بەبنەمای تاکێتی سزا دەبەستن و دەڵێن کاتی بەند کردنەکە جیاواز بێت بەپێی قورسی تاوانەکە بەمەش ئامانجی سزاو چاککردن هەردووکیان بەدی دەهێنن. لەزۆربەی وولاَتاندا سزای زەوتکردنی ئازادی یەکخراو کەجاران لەسێ بەش پێك هاتبوو کەئەمانەبوون: بێگار (کاری قورس لەیاسای میصری‌دا)، بەندکردن لەگەڵ کاری قورسدا، بەندکردن. ئەم سێ‌جۆرە لەیەك سزادا کۆکرانەوە کەئەویش بەندکردنە بەجیاوازی کاتی بەندکردنەکە (کەم یان زۆر)(29).

## ج- سزای دارایی:

ئەم سزایە چەند جۆرێکە وەك پێبژاردن (الغرامة)، دەست بەسەردا گرتن، ڕەتکردنەوە، خەرجی‌یەکان، قەرەبووکردنەوە.

پێبژاردن: بریتی‌یە لەبڕێك پارە ولەتاوانبار دەسێنرێت ودەخرێتە خەزێنەی دەوڵەتەوە لەبری ئەو تاوانەی پێی هەستاوە.

دەست بەسەردا گرتن: واتە لێسەندنی موڵك بەزۆر وپاشان بەبێ بەرامبەر دەخرێتە سەر مولکی دەوڵەت.

ڕەتکردنەوە: گێڕانەوەی پارەو ماڵ بۆ خاوەنە ئەسڵیەکەی.

خەرجی‌یەکان: واتا ناچارکردنی کەسی حوکمدارو بەدانی خەرجی تایبەت بەگشت پرۆسەی لێکۆڵینەوەو دادگایی کردن.

قەرەبووکردنـەوە: واتـا قەرەبووکردنــەوەی ئەوزیانانــەی لـە ئــەنجامی تاوانێکەوە بەکەسێك (تـاوانلێکراو) وکەسـانی تـر کـەوتووە ئینجـا بـەهۆی بێکار بوونی‌یەوەبێت (بەهۆی تاوانەکەوە) یان زیان لێ‌کەوتنی.

پێویستە لەنێوان پێبژاردن و قەرەبووکردنەوەکەدا جیاوازی بکرێت:

مەبەست لە پێبژاردن ئازار چەشتنە نـەك قەرەبووکردنـەوە، هەرلـەم ڕوانگەیــەوە دەبێــت بەســزای تــاوان چونکــە بەتەنــها کەرەســەیەك نییــە بۆبژاردنی زیان، وکاتێك وەك سزا هەژمار دەکرێت دەبێـت ئـەم خەسـڵەتانە لەخۆ بکرێت:

- دەبێت دادگای تاوان بەپێی بنەمای قـەزائی سـزا ئیمـزای بکات وبیسەپێنێ.

- دەبێت بــەپێی بـەندێك لەیاسـای سـزاکاندا ئیمـزا بکرێـت واتـە بەپێی بنەمای شەرعیەتی تاوان وسزا.

- پێویسـتە تەنـها تاوانبارەکـە بیـدات بـەپێی بنــەمای کەســێتی سزا، ونابێت لەهیچ کەسێکی تر (وارث بۆنموونە) بسەنرێت(30).

## قەرەبوو کردنەوە

بــەلأم قەرەبووکردنــەوە مانــای‌تری هەیــەو بریتی‌یـــە لـــەناچارکردنی تاوانبار بەبژاردنی ئەو زیانەی لەتاوانەکەی کەوتۆتەوە (بیکار بوون) لێرەدا دەردەکـەوێت کەپێشـەکی نـاتوانرێت بـەپێی دەقێکـی یاسـایی دەستنیشـان بکرێــت بــەڵکو دادوەر خــۆی مــەزەندەی دەکـــات بـــەپێی داوای زیـــان لێ‌کەوتووەکە.

شایانی باسە (ڕەتکردنەوەو خەرجی‌یە قەزائی‌یەکان) لەسـنووری مانـای قەرەبووکرنــەوەدان نــەك پێبـــژاردن. چونکـــە ڕەتکردنـــەوە (گێڕانـــەوەی

شتومەکە بۆخاوەنەکەی) یەکەمین وێنەی قەرەبووکردنەوەیە. هەروەها ناچارکردنی تاوانبار بەدانی خەرجیە قەزائیەکان ئەویش قەرەبووکردنەوەی تێچوونەکانی داوانامەکەیە.

بەلام پێبژاردنەکانی (یاساکانی باج ورسوم وگومرك) بۆئەوکەسانەی سەرپێچیان دەکەن و بەپێی یاساکانی باج دەسەنرێن. ئەم جۆرە پێبژاردنانە سروشتێکی تێکەلیان هەیە. لەڕوویەکەوە پێبژاردنن (چونکە سزای تاوانن و یاسا دایڕشتون) لەڕویەکی تریشەوە قەرەبووکردنەوەن (چونکە زیانن ولەبەرژەوەندی خەزێنەی گشتی کەوتوون وشوێنەواری تریان لێدەکەوێتەوە).

دوو ڕەخنەی سەرەکی ئاراستەی سیستمی پێبژاردن دەکرێن:

- یەکسانی نێوان تاکەکەسەکان بەدی ناهێنێت، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان کەسەکاندا، هەندێك بەهۆی بەرزی ئاستی داراییانەوە بەئاسانی دەیدەن و بۆهەندێکی تریش زۆر قورسە.
- لەهەندێ حالەتدا ئاستەمە جێبەجێ بکرێت (هەندێ تاوانبار لەپێش جێبەجێ کردنی حوکمدا مالْ وسامانەکەیان پەخش وبلاوە پێدەکەن)

چارەسەری ئەم دوو ڕەخنەیەش بەوەدەکرێت (وەك لەچەندین وولاتدا کراوە) کەهاوسەنگیەك لەنێوان حالەتی دارایی حوکمدارو وئامانجی سزاکەدا (وەك ئازارچەشتن -سزای تاوان-) دروست بکرێت. ئەمەش بەزیادکردنی مەودای نێوان زۆرترین برو کەمترین بری پارەدا تا دادوەر بتوانێت بری گونجاو بەپێی دارایی تاوانبارەکە هەلبژێرێت. یان هەموو برەکە بەیەکجار نەدرێت(بەقیست بدرێ) یان بگۆڕێت بۆبەندکردن ئەگەر

هيچ چارەسەرێك نەبوو. ئەگەر ڕەخنەى يەكەم چارەسەر كرا ئەوا دووەميش چاكدەكرێ وبەئاسانى جێبەجێ دەكرێت(31).

## ڕێوشوێنەكانى خۆپارستن:

ئەم كارە يەك يان كۆمەڵێ ڕێوشوێن دەگرێتەوە وبەسەر كەسێكدا دەسەپێنرێت كەسەلمێنرابێت مەترسى بۆسەر كۆمەڵگا هەيە، مەبەست لێ ئازار چەشتن نييە، بەڵكو دروستكردنى ڕێگر ولەمپەرە لەبەردەمى كۆمەڵگادا دژ بەومەترسىيە. ئەم ڕێوشوێنانە ئاراستەى مەترسىيەك دەكرێن كەلەكەسێكدا هەيە، نەك بۆ تاوانكردن، كەواتە ناوەڕۆكى سزادانانى تيادا نييەو بەماناى ناو زڕاندنيش نايەت بەڵكو ئاماژەيە بۆ چاككردن. بۆيە ئاراستەكانيان ڕوو لەئاييندەيە بەلاَم ئاراستەى سزادان بۆ ڕابردووە(32).

ئيمزاكردنى ڕێوشوێنەكانى خۆپاراستن بەسەر كەسێكدا لەم حاڵەتانەدا دەبێت:

<u>يەكەم</u>: پێشتر بەتاوانێك هەستابێت.

<u>دووەم</u>: مەترسىيەك لەكەسەكەدا هەبێت لەواتايەكىتردا پىێ دەوترێت مەترسى تاوانكارى.

كەرەسەكانى ڕێوشوێنى خۆپاراستن بريتين لەكۆمەڵێك شێوازى چارەسەر كردن وپاكژكردنەوەو تەمێ كردن كەئامانجيان ڕاهێنانەوەى تاوانبارە يان دورخستنەوەو ڕێگرتنە لەپيادەكردنى ڕەفتارى زيان بەخش. دەكرێت بڵێين ئەم ڕێوشوێنانە يەك ئامانجيان هەيە ئەويش بەرگرتنە لەو مەترسىيە شاراوەيەى لەكەسێكى تاوانباردا هەيە دژ بەكۆمەڵگا،

لەدەســـتەواژەیەکی شــیاوتردا بریتی‌یــە لەئاســـایش بۆیــە ناویشـــنراوە ڕێوشوێنەکانی ئاسایش(33).

ڕاهێنانەوەی تاوانبار مانای بەستنی پەیمانێکە لەنێوان کەسی تاوانبـارو کۆمـەڵگادا بۆچارەســەرکردنی ئەگــەر نــەخۆش بێـت یـان لادەر بێـت یـان بێکـاربێت، بـەم شـێوەیە ئـەو پەیوەندی‌یـە دەپچڕێت لـەنێوان فاکتـەرەکانی تاوانکردن وکەسەکەدا وئیتر لەگەڵ کۆمەڵگاکەی خۆیدا خۆی دەگونجێت.

بەلاَم دورخستنەوە پـەیوەندی بـەجێگاو شـوێنەوە هەیـە، مەبەسـت لێ‌ی جیاکردنەوەی تاوانبارە لەو شوێنەی کە ڕێگای تاوانی بۆخـۆش دەکـات، وەك گرتنی ئەوکەسەی لەسەر تـاوانکردن ڕاهـاتووە یـان دوورخسـتنەوەی بێگانـە لەووڵات، یان بەزۆر نیشتەجێ‌کردن.

بەلاَم ڕێگرتن: مەبەست لێ‌ی دابڕینـی تاوانبـارە لەوکەرەسـە مادی‌یانـەی لەتاوانکردندا بەکاریان دەهێنێت وزیان بەکۆمەڵگا دەگەیەنێت بەمـەش وای لێ دێت نەتوانێت تاوان بکات وەك: دەست بەسەراگرتن (المصادرە)، داخستنی دەزگاو دامەزراوەکەی، یان بخرێتە ژێرچاودێری پاسەوانی‌یەوە(34)، (35).

## جۆرەكانی دامەزراوە سزایییەكان

### يەكەم: دامەزراوە داخراوەكان (المؤسسات المغلقة)

ئەم دامەزراوە سزايىيانە پابەندی بیرۆكەيەكن كەبريتىيە لە: دابڕينی تاوانبارى حوكمدارو لەكۆمەڵ بەهۆى مەترسيەكانيەوە. پراكتيزەكردنی ئەم بيرۆكەيە واپێويست دەكات چاودێريەكی توندو پتەوو تۆكمە بەسيمای دامەزراوەكانەوە ديار بێت وسڵ لەكەسی حوكمدراو بكرێت و، ڕێوشوێنی تەمێكردن بسەپێنرێت بەسەريدا، بەو مەبەستەكەی سزاكەی كاريگەرانە جێبەجێ بكرێت، جگەلە گرتنە بەری شێوازەكانی پاسەوانی ورد تائاسايش وسيستمی ناوخۆی دامەزراوەكە پارێزراوو بەرقەراربێت.

ئەم جۆرە دامەزراوانە بۆ ئەوحاڵەتانە دەگونجێت كەمەبەستی سزادان بريتیبێت لەبەرگرتن ودروست كردنی لەمپەر نەك چاككردن، زياتر ئەوكاتانەش پەنای بۆدەبرێت كەسزاكە درێژخايەن بێت ياخود گوناهبار لەودەستەو تاقمانە بێت كەمەترسیدارن ولەسەر تاوان و گەڕانەوە بۆتاوان ڕاهاتوون(36).

### دووەم: دامەزراوە كراوەكان (المؤسسات المفتوحة):

ئەم جۆرە لەدامەزراوە سزايىيەكان پابەندی بيرۆكەيەكە بڕواو متمانە بەحوكمدار دەكات وپێیوايە هەست بە لێپرسراوێتی دەكات. لەم دامەزراوانەدا دەرگاو شوراو شيش بەندی و كليلدان وپاسەوانی لاوازن

چونکـه حوکمدارەکـانی ناویـان مرۆڤـی چـاکن ورێـز لەسیســتم دەگــرن ولەهـەولّی ڕاکـردن وهـەلاّتندا نـین وباوەڕیـان بەوەیـە مانـەوەیان لـەناو دامەزراوەکەدا چاکترەو سودی لیّدەبینن. ئەم دامەزراوانە زیاتر لـەدەرەوەی شارو لەگوندەکاندا دادەمـەزرێن ولەهـەندێ وولاّتـی وەك بـەلجیکاو هوڵنـداو سویسراو ئیتالیاو ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا دا پەیڕەو دەکرێن(37).

لایەنە باشەکانی:-

- حوکمدراو تیایدا سـەرلەنوێ بڕوابـەخۆی دەکاتـەوەو ئـەوەی بۆدەردەکـەوێت کۆمـەڵگا مامەڵەیـەکی دوژمنکارانـەی لەگــەڵدا ناکــات و، ئەمەش پرۆسەی گونجاندنی کۆمەلاّیەتی بۆ ئاسان دەکات.
- لەودامەزراوانـەدا حوکمـدارو ئـەو دەرفەتـەی بۆدەڕەخسـێت لەکاتی گونجاودا کاری گونجاو بدۆزێتەوە وبیکات، چونکـە بـاروزروفی ژیـانی نـاو دامەزراوەکە جیـاوازی نییـە لەگـەڵ بـاروزروفی کـارکردن لـەدەرەوەی دامەزراوەکە.
- بەندکراو ئەتوانێت و بۆی هەیە سەرپەرشتی ویارمەتی دارایـی خێزانەکەی بکات.
- بەندکراو دووردەکەوێتەوە لەتێکەڵ بوون ومامەڵەکردن لەگـەڵ تاونکارە مەترسیدارەکانی دامەزراوە داخراوەکان.
- دەوڵەتیش لەڕووی دارایی‌یەوە کەڵکیان لیّوەردەگرێت.

لایەنە خراپەکانی:-

گـەورەترین خـەوش وناتەواوی‌یـەك لـەم دامەزراوانـەدا ئاسـانی ڕاکــردن وهەلاّتنـە، هـەروەها کەمکردنـەوەی بایــەخی سـزادانە (بـەمانای بــەرگرتن وبێزارکردنی تاوانبار) جگەلەوەی لەگەڵ هەموو کەسێکدا ناگونجێت(38).

**سێیەم: دامەزراوە نیمچـــە کراوەکـان (المؤسســات شــبە المفتوحة)**

حوکمـدارو لـێرەدا بەشـوێنێك ئەسـپێردرێت کەپاسـەوانی تیـایدا تونـدو تۆکمـەتر بێـت لەدامـەزراوە کراوەکـان و، ئـازادتریش بێـت لەدامـــەزراوە داخراوەکان. ئەمە ئەگەر حاڵەتەکەی واپێویسـت بکـات بڕواپێکردنـی تـەواو (لەکراوەکاندا) وسڵەمینەوەی تەواو (لەداخراوەکاندا) نەبێت وبەشێوەیەکی مـــام نـــاوەندی مامەڵـــەی لەگـــەڵدا بکرێـــت، دەشـــێت بەندیخانەیـــەکی سەربەخۆبێت یان بەشێکی سەربەخۆبێت لـەنێو بەندیخانەیـەکی داخـراودا. زۆرجـار ئـەم جـۆرە دامـەزراوە چـەند بەشـێك لـەخۆدەگرێت ولـەڕوی پاسەوانی‌یەوە پلەپلەیە، واتا لەسـەرەتادا حوکمـدراو ولەوبەشـەدا دادەنرێـت لەپاسـەوانی تیـایدا تونـدو تۆڵـە پاشـان دەگوێزرێتـــەوە بـــۆ بەشـــێکی‌تر کەپاسـەوانی تیـایدا مامناوەندیـە ئەگـەر بـاش بوونـی ڕەفتـاری بسـەلمێنێت، لەکۆتایشـــدا دەخرێتـــە ئەوبەشـــەوە کەپلـــەی پاســـەوانی تیـــایدا نزیکـــە لەدامـــەزراوە کراوەکانـــەوە بەتایبـــەتی لـــەکاتی نزیـــك بوونـــەوەی وادەی ئـــازادکردنیدا. ئـــەم دامـــەزراوە بەگشـــتی گێڵگـــەو وەرشـــەو جێگـــای وەرزش وخوێندنگاو بەسەربەردنی کاتی بێئیشی لەخۆ دەگرێت(39)، (40).

## چەرخە هەمەجۆرەکانی پەرەسەندنی سزا

- سەردەمی تۆڵە سەندنەوەی تاکایەتی:

لەم چەرخەدا ناوکێو مل ملانـێی نێوان تـاك وگروپـەکان لـەئارادابووە وتۆڵـە سـەندنەوە بـاووبوە وهەرکەسـێك بۆخـۆی تۆڵـەی لەبەرامبەرەکـەی کردۆتـەوەو ئەمـەش بۆخـۆی زنجیرەیـەك کێشـەی لـەنێوانیاندا دروسـت کردووە، یان لەهەندێ حاڵەتدا خوێنبایی لە پیاوکوژەکە سەنراوە(41).

- سەردەمی تۆڵەسەندنەوەی گشتی:

دوای پەرەسەندنی کۆمەڵگاو سەرهەڵدانی بەرژەوەندی هاوبەش وگشتی، ئیتر کۆمەڵگا پێویستی بـەوە دەکـرد داکۆکـیو پارێزگـاری لەقـەوارەی خـۆی بکات. وای لێهات تـاوان بەدەسـتدرێژی بۆسـەر تاکەکـەس هـەژمار نـەدەکراو تۆلەسـەندنەوەی تاکایـەتی گـۆڕرا بۆتۆڵـە سـەندنەوەی گشـتیو، سـزا لەدەزگایەکی کۆمەڵایەتییەوە دەردەچوو بەومەبەسـتەی خـەڵکانیتر تـەمێ بکات ودووربکەونەوە لەتاوان. سزاکانیش هەردەم توندو تیژو قـورس بـوون وەك سزای لەسێدارەدان. بـەڵام ئـەم سـزایانە نەبوونـە هـۆی کەمکردنـەوەی تاوان بەڵکو بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوانە تـاوان زیـادی کـردو، چـەندین چاکساز سـەریان هـەڵداو بانگەشـەی چاککردن و هـەڵگرتنی سـزای لەسـێدارەدانیان دەکرد یان لەهەوڵی چاککردنی بەندیخانەکاندا بوون.

- سەردەمی بەزەیی ومرۆڤایەتی:

لـەم سـەردەمەدا نۆبـەرەی چـاککردنی کۆمەڵایـەتی سـەری هـەڵدا، لەفەرەنسا مۆنتیسکیۆو ڤۆلتێر، هیوم وسمس لەبەریتانیا، بیکارێ لـەئیتالیا

پیّ وابوو مەبەست لەسزادان گۆڕین وئەشکەنجە نییە بەڵکو مەبەستی تری هەیە وەك ڕێگرتن لەتاوانبار بۆدووبارە کردنەوەی تاوانیتر یان کەسانی تر شوێن پیّ هەڵنەگرن بۆیە هیچ سودێك لەتوندوتیژی سزا ناکەوێتەوە ولەسێدارەدانیش هیچ بەهیچ ناکات.

- سەردەمی زانستیی نویّ:

لەم سەردەمەدا لەدوای شکست هێنانی سزای قورس وتوندو وبەندیخانەی خراپەوە، ڕووکرایە چاککردن وهەڵسەنگاندن بەتایبەتیش لەدوای سەرهەڵدانی ڕێبازی واقیعی کەپیّ وایە کارە تاوانییەکان بەرئەنجامی بارو زروفی کۆمەڵایەتی دەوروبەر وشەخسی تاوانبارەکەیە بۆیە پێویست دەکات چاو بەهەموو باروزروفەکانیدا بخشێنرێتەوە وچاککردن هەبیّ وکەسەکە بگێڕدرێتەوە بۆکۆمەڵگا(42)، (43)، (44).

## سەرهەڵدانی بزاڤی چاککردن

بەندیخانــەی کــۆن لــەژێر کاریگــەری ئەوفەلســەفەی ســزایەدا بــوو کــەپێیوابوو ســزا کــەفارەتی گوناهکردنــە واتــا ســزادان بەرهــەمی گوناهکردنە ودەبێـت گوناهبـار بیچێژێـت. بـەلاّم لـەنیوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەهــەمدا ولەگــەڵ دەرکــەوتنی بزوتنــەوەی چــاککردندا ئیــتر ئــەرکی بەندیخانـە گـۆڕا، لەگـەڵ پەرەسـەندنی زانسـتە کۆمەلاّیەتیـیـەکاندا ئـەرکی چــاککردن بــەرەوپێش چــوو و پــەرەی ســەند. لــەنێو بــەناوبانگترین بەڕێوەبەرانی زیندانـدا ئەوانەیان کە بڕوایـان بـەچاککردن هـەبوو لـەجیاتی سـزادا، وەك ئامـانجی سـەرەکی بەندیخانـەکان (جـورج اۆبرمـایر) و(الکـیرنل مونتیسیون) بوون، تاوای لێهات چاککردن بووبە ئـەرکێك لەبەندیخانـەکاندا کەشایەنی گفتوگۆ لەســەر کــردن نــەبێت و، ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ لــەوولاتاندا لایــەنگرانی ئــەم بزوتنــەوە ڕوولــەزیادبوون بــوەو لەچــەند دامــەزراوێکی چاککردندا دەرکەوتن ولێرەدا ئاماژەیان پێدەکەین(45)، (46).

### یەکەم: سیستمی دامەزراوەی ئەلمیّرای چاککردن:

سیستمی ئەم دامەزراوە نموونەیەکە بۆ پڕاکتیزەی بنەماکانی چـاککردن بـەپێی ڕێکـەوتنی کۆنگـرەی بەندیخانــەکان. سیســتمەکەش لــەم خالاّنــەدا ڕووندەکەینەوە:

1-لــەم دامــەزراوە چاکســازییەدا زیندانیــیــەکان بەســەر ســێپلەدا دابەشکرابوون، سەرەتا کەبەندکراو بۆیەکەمجار دەخرایە بەندیخانەوە هــەتا شەش مانگ لەپلەی دووەمدا دادەنرا، ئەگەر ڕەفتاری جوانی لێ دەربکەوتایە

دەخرایە پلەی یەکەمەوە، بەلاّم لەشەش مانگی دووەمدا لەم پلەیەدا شایانی ئەوەبوو بەشێوەیەکی مەرجدار ئازاد بکرێت.

2-خۆئەگەر زیندانییەکە ڕەفتاری خراپ وهەڵسوکەوتی ناشرینی بنواندایە ئەوا سزا دەدرا بەوەی بخرێتە پلەی سێیەمەوە.

ئەم دامەزراوە لەساڵی 1876 لەشاری نیویورک(47) لەژێر چاودێری یرگوای دا دامەزرا وهەوڵی دەدا لەسەربنەمای نوێ مامەڵە لەگەڵ ئەوکەسانەدا بکات کەلە یاساکان دەرچووبوون، گرنگترین ئەو بنەمایانەش کەپشتی پێبەستبووبریتی بوون لە:-

- تاوانبار کەسێکەو دەشێت هەڵبسەنگێنرێت وچاکبکرێت.
- چاککردن پێویستی تاکەکەسە وئەرکی کۆمەڵە.
- هاوکاری تاوانبار لەگەڵ کۆمەڵدا فاکتەرێکی گرنگە لەنێو فاکتەرە یاریدەدەرەکاندا بۆپرۆسەی چاککردن.
- دەبێت چاککردن پەروەردەییو ئاکاری وپاکژکردنەوەیی بێت.
- زۆر گرنگە زیندانی یەکێك لەپیشەکان فێرببێت ونابێت لەزیندان بێتە دەرەوە ئەگەر بەباشی کارێك فێر نەبووبێت کەڕێ خۆشکەر بێت بۆ دوورخستنەوەی لەهەڵەو لادان وهۆیەکانی تاوانکردن.

6-دەبێت چارەسەرکردنی تاوانبار تاکایەتی بێت ولەگەڵ پێداویستییە تایبەتییەکانیدا بگونجێت تابتوانرێت سەرلەنوێ کەسێتییەکەی ڕێکبخرێتەوە(48).

## دووەم: سیستمی ئێرلەندی چاککردن:

ئەم سیستمەی چاککردن لەساڵی 1853دا لەدوورگەی نۆرفولکی ئوسترالیا سەری هەڵدا کەئەو دەمە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوو، ئەم سیستمە بەو ئەزموونە دادەنرێت کەچاکسازەکان وەك سەرچاوەیەك بۆ چاککردن بۆی دەڕوانن. تیایدا بەندیخانە گۆڕرا بۆ چاککردنی لاوان، ئامانجی ئەم دەزگای چاککردنە، ڕاهێنانی زیندانیەکانە بۆئەوەی بتوانن ڕووبەڕووی کەرەسەکانی لەخشتەبردن و سەرنج ڕاکێش ببنەوە وڕۆنەچن بەرەو تاوان و، بەشێوەیەك ڕەفتار بکەن لەگەڵ بنەماکانی یاسادا بگونجێت وەل کەچی ببن تائەوکاتەی ئازاد دەکرێن(49).

ئەم نموونەیەی چاککردن لەزانستی سزای نوێدا بوو بەپێشەنگ وچەندین دامەزراوی چاککردنی مێردمنداڵان ولاوان شوێن پێیان هەلگرت. دامەزراوەی ئەلمیرای چاککردنی لاوان لەساڵی 1877 بەدواوە هەمان ئەو سیستمەی پیادە دەکرد کەسیستمی ئێرلەندی دایهێنابوو.

## سێیەم: سیستمی بورستاڵی چاککردن:

پەرەسەندنی فەلسەفەی سزادان وابەستەی هەندێ کارتێکەرو ڕای نوێیە کەلە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوێزرێتەوە. دامەزراوەی بورستاڵ لەئینگلتەرە لەهەرێمی بورستال ساڵی 1908 سەری هەڵداو بۆئەوکەسە (نێر) تاوانبارانە بوو کە تەمەنیان لەنێوان (16-21) ساڵیدایە. دیاری کردنی ئەم تەمەنەش دەگەڕێتەوە بۆئەو ڕاستی‌یەی کەمرۆڤ لەوتەمەنەدا مەترسی زیاترە بۆتوش بوون وهەڵخزان بەرەو تاوان. ئەم حەقیقەتەش زاناکانی تاوان لەئەمەریکا سەلماندوویانە(50).

سیستمی بورستالی ئینگلیزی ئامانجی ئەوە بوو مێردمندالی تاوانبار چاك بكات، بیرۆكەی چارەسەركردنیش لەودامەزراوەدا كاتێك تاوانبار تیایدا دەمێنێتەوە بۆماوەی چوارساڵ، واتە كاتی بەند كردن تەنها چوارساڵە ئیتر تاوانبار هەركەسێك بێت وتاوانەكەشی هەرچی‌یەك بێت لەوماوەیە زیاتر لەودامەزراوەدا نامێنێتەوە وئازاد دەكرێت دوای چاككردنی.

## چوارەم: سیستمی چاودێریكردن:

تازەترین سیستمی چاككردنە كەئەمڕۆ لەزۆربەی وولاّتاندا پەیڕەو دەكرێت چاودێریكردنەو، بریتی‌یە لەوەی حوكمەكە بەسەر تاوانباردا جێبەجێ ناكرێت یاخود لەبنەڕەتدا حوكمەكە دەرناكرێت. دیارە ئەو بڕیارەش لەلایەن دەزگای قەزائی‌یەوە دەردەچێت، تاوانبار بەپێی ئەم سیستمە ناخرێتە بەندیخانەوە بەڵكو تەنها لەژێر چاودێریدا دادەنرێت. بەتایبەتی ئەو تاوانبارانەی مێردمنداڵن یاخود سەرەتای تاوانكردنیانەو وپێشتر هیچ تاوانێكیان ئەنجام نەداوە، چاكسازە كۆمەلأیەتی‌یەكان گرنگی ئەم سیستمە لەوەدا دەبیننەوە كەپارێزگاریو چاودێریكردنی تاوانباری منداڵ ومێردمنداڵە، لەتوش بوون بەدژواریەكانی نێو زیندان وتێكەڵ بوون لەگەڵ گەورە تاوانبارەكاندا، بۆیە لەدەرەوەی زیندان بۆماوەیەكی دیاریكراو دەخرێنە ژێر چاودێری‌یەوەو ئەو ماوەیەش پێی دەوترێت ماوەی تاقیكردنەوە (الاختبار) ودەبێت مانگانە ڕاپۆرت سەبارەت بەكارەكانیان پێش كەش بكەن و، ناچاریش بكرێن قەرەبووی ئەو زیانانەش بكەنەوە كەلەخەڵكی تریان داوە بەهۆی دەستدریژی یەكانیانەوە. شایانی باسە ئەم سیستمە بۆئەو تاوانبارانەشە كەبەڕێكەوت تاوانیان ئەنجام داوە(51).

## سیستمی بەندیخانەكان

مەبەست لەسیســتمی بەندیخانــە بریتـیـیــە لەچۆنیــەتی ئــەو ژیانــەی بەندكراوەكان لەنێو زیندانـدا بەسەری دەبەن وەك تەنــهایی یـان تێكـەڵبوون لەگەڵ یەكتـرداو شێوازی پراكتیزە كردنی بەرنامــەی چاككردن بەسـەریاندا. لە زۆربەی وولاَتاندا یەكێك یان زیاتر لەم پێنج سیستمە پەیڕەو دەكەن:

### یەكەم: سیستمی كۆمەڵی

لــەم سیســتمەدا بــەندكراوەكان شــەوو ڕۆژ لەگــەڵ یــەكتردا ژیــان دەگوزەرێنن، لەشوێنەكانی: كاركردن، نان خواردن، گۆڕەپان، فێركردن...تـاد، وبەشـێوەی گــروپ گــروپ لەشــوێنی گــەورەو فــراوان بــەپێی ژمــارەی بــەندكراوەكان جێگــای نووســتنیان بــۆ دابــین دەكرێــت و، لەیــەكتری جیاناكرێنــەوە، جیاكردنــەوە تەنــها بۆئــەم حاڵەتانەیــە: جیاكردنــەوەی بەندكراوی پیاوان لەژنان، گەورە لەبچوك (بەپێی تەمەن)(52).

لایەنــە چاكەكانــە ئــەم سیسـتمە لەوەدایـە: تێچوونــی كەمــە، ڕێوشــوێن وكاروبارەكــان ئاســانن وەك دامــەزراندنی بەندیخانــە وبــەڕێوەبردنی و، سیستمی كاركردن وفێركردن و،كەمتریش زیان لەدروستی عـەقڵ ودەروونـی زیندانی یەكان دەدات.

چـەندین كـەموكورتی لــەم سیسـتمەدا هەیــە كەلــە بنچینــەوە بــەهای چاككردنەكەی لەبەین دەبـات. تێكـەلاَو بوونـی بـەندكراوەكان بەشـێوەیەكی

بەردەوام و بەو ژمارەیە گەورەیە بوارێکی تەواو دەرەخسێنێ بۆ تاوانبارە بچوکەکان تا بەتاوانکارە گەورەکان بگەن و فێری چەندین شێوازو هونەری تاوانکردن ببن، هەروەها دەرفەتیش دەدات بەتاوانبارە گەورەکان تابەندکراوی بچوك وساویاکە هەڵبژێرن وبیخەنە پاڵ خۆیان وگروپی تاوانکارن پێکبهێنن وئامادەیان بکەن بۆکارکردن لەگەڵیاندا لەدوای هاتنە دەرەوەیان لەزیندان(53).

هەروەها بۆتاوانکارە پڕ لەئەزموونەکانیش بوار دەرەخسێنێ تاچەندین ڕێکەوتن ونەخشە دابڕێژن لەنێوان خۆیاندا بۆئەنجامدانی تاوانی پڕ مەترسی، ئەم دەستەو گروپانەش لەدوای ئازادکردنیان وتەواوکردنی ماوەی بەندکردنەکەیان چالاکیەکانیان دەست پێدەکەن. ئەمانەو جگەو لە دروست کردنی ڕای گشتی لەناو خۆیاندا دژ بەکارگێڕی بەندیخانەو پەك خستنی کاروبارەکانیان ورەت کردنەوەی ڕێنماییو زۆرجاریش مانگرتن ویاخی بوون.

### دووەم: سیستمی تەنهایی :

بناغەی ئەم سیستمە بریتیە لەدابڕینی تەواوەتی بەندکراوو پچڕاندنی پەیوەندی تاوانبار بە بەندکراوەکانی ترەوە. ئەم گۆشەگیر کردنە بەبەندکردنی تەواوی تاوانبار دەبێت لەشوێن وژورێکی تەنهادا تائەوڕۆژەی ئازاد دەکرێت. بەڵام بەندکراو فەرمانبەرو کارمەندی بەندیخانە دەبینێت و بەمامۆستاو پیاوی ئاینی وکەسانی پەیوەندار دەگات. هەروەها ڕێگای پێ دەدرێت لەژورەکەیدا ئیشی دەستی بکات وبخوێنێتەوە وبنوسێت، ڕۆژانە جارێك یان دووجار بۆمەبەستی وەرزشکردن بێتە دەرەوە بەمەرجێك لەجێگایەکی دابڕاودا وەرزشەکەی بکات. بەندیخانەی تەنهایی دەبێت

چەندین ژووری بەندکردنی تیادا بێت ولەهەر یەکێکیاندا بەندکراو بواری ئەوەی هەبێت کاری ڕۆژانەی بکات، وەك کارکردن وخواردن وخواردنەوەو خۆشتن وپاك وخاوێنی وگەرماو پێشاو، وتیایدا وانەکانی ئامادەکردن وڕاهێنانەوە وچاککردن وەربگرێت(54).

مێژوی ئەم بەندکردنە دەگەڕێتەوە بۆبنەمایەکی ئاینیو، بۆیەکەم جار لەساڵی 1790دا کەنیسە لەشاری فیلادلیفیا لەویلایەتی پەنسلڤانیا پیادەی دەکرد، بۆیە بەسیستمی (پەنسلڤانی) ناو زەدکراوە، ئەمەش لەسەر ئەوبناغەیەی کەگوایە تاوانبار گوناهێکی کردووە و، بە بەپاکژکردنەوە کەفارەتی گوناهەکەی دەدات، ئەمەش تەنها بەوە دەکرێت کەلەشوێنێکی دابڕاودا بەندبکرێت تابەخۆیدا بچێتەوە تۆببە بکات وبگەڕێتەوە وخوابپەرستێت(55).

ئەم سیستمە لەزۆربەی بەندیخانەکانی پەنسلڤانیا پیادە دەکرا، پاشان لەئەوروپادا: ئینگلتەرە ساڵی 1842، بەلجیکا ساڵی 1844، فەرەنسا 1848، کۆنگرەی فرانکفۆرت ساڵی 1846 و کۆنگرەی برۆکسل ساڵی1847 بڕیارپیاندا جێبەجێ بکرێت.

هێنانەکایەی سیستمی تەنهایی وپراکتیزە کردنی، کاردانەوە بوو دژ سیستمی کۆمەڵی وبۆ بەرگرتن لەخراپییەکانی تێکەڵکردنی بەندکراوەکان، زۆربەی زاناکانی سزادانیش پشتگیریان کرد وبەسزایەکی گونجاوی قورسیان دادەنا دژ بەتاوانکارە مەترسیدارەکان، هەروەها بۆگارگێڕی بەندیخانەش هەبوو کەبەتەواوی جیایان بکاتەوە لەیەکتر وهەریەکە مامەڵەی تایبەت بەخۆی لەگەڵدا بکات.

ڕەخنەو کەموکورتییەکانی ئەم سیستمە لەم چەند خاڵەدا کۆدەکرێنەوە:

- تێچوونی زۆرەو دارایی زۆری پێویستە بۆ ڕێکخستنی ژوورە تەنهاییەکان.
- ئامادەکردنی مامۆستاو پیاوانی ئایینی وچاکسازەکان بۆهەریەکێ لەبەندکراوەکان کارێکی قورس وزەحمەتە.
- دژ بەسروشتی مرۆڤایەتییەو دەبێت زیندانی تێکەڵ بەخەڵکیتر ببێت ولەگەڵیان بدوێ.
- کاری خراپ دەکاتە سەر لایەنی ژیانی عەقڵی ودەروونی وتوش بوون بە نەخۆشیو تەنانەت خۆکوشتنیش یان پەکخستنی کاری چاککردن.
- لە دوای ئازاد کردن توانای تاوانبار بۆگەڕانەوەی بۆناو کۆمەڵگاو ژیانی ئاسایی کەم دەکاتەوەو نایهێڵێت.
- ڕێگرە لەبەردەم ڕێکخستنی کاری نێو بەندیخانە چونکە ڕێکخستن پێویستی بەکۆکردنەوەی بەندکراوەکانە لەشوێنێکدا(56).

## سێیەم: سیستمی تێکەڵاو:

ئەم سیستمە کۆکەرەوەی هەردوو سیستمی تەنهایی وکۆمەڵییە و، بۆیەکەم جار لەبەندیخانەی (ئۆبۆرن Auburn) لەویلایەتی نیویورك ساڵی 1821 جێبەجێ کراوە، بەمەبەستی چارەسەرکردنی کەم وکورتییەکانی هەردوو سیستمەکەی پێشوو، تیایدا بەندکراوەکان لەڕۆژدا بۆکارکردن ووەرزش وپشوودان ونان خواردن ونوێژکردن وفێرکردن تێکەڵ دەکران بەشێوەیەك بێدەنگی تەواو بپارێزن ولەگەڵ یەکتردا ئاخاوتن نەکەن، لەشەویشدا لەیەکتری جیادەکرانەوە، لەبەر ئەوە ئەم سیستمە تێکەڵە ناونرا (سیستمی بێدەنگی)(57).

لایەنــە چاکــەکانی ئــەم سیســتمە لەوەدایــە تێچوونــی کەمــە چونکــە ژوورەکــانی تەنــها بۆمانــەوەی بــەندکراو ئامــادەدەکران وپێویســتیان بــەو کەرەســەو پێداویستیانە نــەبوو کەلــەژوری تەنــهایی دا دەبوایــە هەبونایــە، هــەروەها لــەڕووی کارگێڕیــەوە ئــەوەندە کارمــەندو مامۆســتاو ....تــاد، نەدەویست، ئەمانەو جگەلەوەی ڕێکخستنی کارکردن لەناو بەندیخانە ئاسان بوو، وەبواری بەبەندکراو دەدا تێکەڵ بەکەسانی تر ببێت(58).

بــەڵام لایــەنی خراپــی لــەوەدا بــوو کەزەحمــەت بــوو بێدەنگــی بەســەر زیندانیەکاندا بسەپێنریت وپاسەوانەکان ناچار دەبوون لێدان بەکاربهێنن وکارگێڕی بەندیخانەکەش دەبوایە سەرپێچیکەرانی سزا بدایە. بۆیە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم کێشەیەدا ڕێگاچارە دۆزرایەوە بە کەمکردنــەوەی شێوازی سەپاندنی یاساکانی بێدەنگی و، وای لێهات ڕێگا بەزیندانیەکان دەدرا لەکاتی پشــوودان ونــان خواردنــدا لەگــەڵ یــەکتردا بدوێــن، تەنانــەت لــەکاتی کارکردنیشدا بەمەرجێك قسەکردن کارنەکاتە سەر ڕەوتی ئیشەکەیان.

### **چوارەم**: **سیستمی پلەدار**:

لێرەدا ماوەی بەندکردنەکە بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت (3-5 قۆناغ) لەقۆناغی توندوتیژی یان تۆکمەیی دابڕین وتەنهاییــەوە بۆکــەم کردنــەوەو خاوکردنەوەیو، پاشان بۆ زەوتکردنی ئازادی (بەشێوەیەکی پلەدار).

لــەقۆناغی یەکــەمدا: بــەندکراو، سیســتمی تەنــهایی بەشــەوو بــەڕۆژ بەسەردا پراکتــیزە دەکرێت، پاشــان تەنـها لەشــەودا دابــڕاوو تەنـها دەکرێت وبەڕۆژ تێکەڵ بەبەندکراوەکانی تر دەبێت ورێگای سەردان و چاوپێکەوتنی لێناگیرێت وبۆی هەیە نامە گۆڕینەوە بکات و، دەشتوانێت لەڕۆژدا کاربکات

(لـەدەرەوەی ژورەکـەی خـۆی) وشـەو بگەڕێتـەوە جێگـای خـۆی، لـەدوا قۆناغیشدا سیستمی ئازادکردنی مەرجداری بەسەردا پراکتیزە دەکرێت.

شایـەنی باسـە ئـەم سیسـتمە بۆیەکـەم جـار لەیـەکێ لەدورگـەکانی ئوسـترالیا (نورفولـك) سـاڵی 1840دا(59) جێبـەجێکراوە لەسـەر دەسـتی (ئەلێکسـەندەر مـاکۆنۆچی) هـەر لەبـەر ئەمەیـە پلـەدار بـە (سیسـتمی ماکۆنۆچی) ناودەبرێت وپاشان گوێزرایەوە بۆ ئینگلتەرە وئێرلەندەو دواتـر بە (سیستمی ئیرلەندی ناسرا)(60).

برینـی ئـەو قۆناغانـەی ئاماژەمـان بۆکـردن، پەیوەسـتە بـەڕەفتاری زیندانـی و ئـەو نمرەیـەی وەریدەگرێـت، لـەڕێگای نمرەکانیـەوە ئـەوە دەردەکـەوێت تاچـەند بەرنامـەکانی چـاککردن لـەڕەفتارەکانیدا ڕەنگـی داوەتـەوە ووەریگرتـووە، هـەروەها ئـەم گواسـتنەوەیە لەقۆناغێکـەوە بۆقۆنـاغێکی تـر خـۆی لـەخۆیدا خـەلاَتکردن وپاداشـتە تـاکو بـەندکراو بەخۆیدا بچێتەوەو ڕەفتارەکانی چاك بکات.

ڕەخنەیـەك کەئاراستەی ئـەم سیستمە دەکرێت ئەوەیـە کەقۆناغـەکان بەپێچەوانەشەوە دەگەڕێنەوە بۆسەرەتا، واتا بـەند کـراو بـۆ قۆنـاغی پێشـتر دەگەڕێتـەوە ئەگـەر هـاتوو نەیسـەلماند کـە چـاککردن لـەڕەفتارەکانیدا ڕوویـانداوە. هـەروەها لـەقۆناغی یەکەمیشدا بـەندکردنی تەنـهایی بـەڕۆژو بەشـەو سـزایەکی دڵڕەقانەیـەو هیـچ پاسـاوێك نییـە بۆئـەو دابڕینە یەکجارییە.

**پێنجەم: (سیستمی چاككردن)**

بۆیەكەم جار لەشاری نیویورك لەدەزگای چاككردنی ئـەلمێرا سـاڵی 1876 جێبـەجێ كـراوە، بەسـەر ئەوكەسـانەدا كەتەمـەنیان دەكەوتـە نێـوان 16-30 ساڵییەوە. لەم سیستمەدا سێپلە هەبووە بەم شێوەیە:

لەسـەرەتادا كـاتێك بـەندكراو دەخرایـەوە زینـدانـــەوە لەپلـەی دووەمــدا دادەنرا، لەدوای شەش مانگ ئەگەر بیسەلماندایە ڕەفتاری خۆی چاككردووە ئەوا دەگوێزرایەوە بۆپلەی یەكەم، خۆئەگـەر دەربكەوتایـە ڕەفتـاری خراپـتر بـووە ئـەوا ئەخرایـە پلـەی سـێیەمەوە، ئەوكەسـەی دەخرایـــەوە پلـــەی یەكەمـەوە لـەدوای شـەش مـانگ بەسـود وەرگرتـن لەسیسـتمی (ئـازادكردنی مەرجدار) لەبەندیخانە ئازاد دەكرا. ئەوكەسەی دەخرایـە پلـەی سـێیەمەوە لەوێدا دەمایەوە تـاكو ڕەفتـاری خـۆی چـاك دەكـرد وئینجا بەپلـەكانی تـردا تێدەپەڕی.

لەم سیستمەدا گرنگییەكی گەورە ئاراستەی فێركردن وكاری بەرهەمدار دەكرا، بەهۆی نیشانەكانی چاككردنەوە ئازادی دەگەڕێنرایەوە بۆ بـەندكراو، ماوەیەكی دیاری كراو نەبوو بۆ حوكمدان وئازادكردنی مەرجدار. لەتـەواوی بەندیخانـەكانی ئەمـەریكادا ئـەم سیسـتمە سـاڵی 1876 پیـادەكراوە هــەروەها لەئەوروپاش هەمان ڕێوشـوێن پیـادەدەكرا. ئـەم سیسـتمە نـاكۆكی ومـەودای نێوان بۆچونی سزادان وبۆچوونی چاككردنی گەورەتر كردەوە(61).

## ڕەفتارو مامەڵەکردنی سزایی

مەبەست لەمامەڵە کردنی سزاییيانە بریتیيە لەچۆنیـەتی ڕەفتـارکردن لەگەڵ بەندکراوەکاندا لەنێو زیندان یان لەدەرەوەیدا، بۆئەوەی سـەر لـەنوێ بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی ڕابهێنرێتەوە.

ئـــەم مەســـەلەیە لەیەکـــەمین گۆنگـــرەی نێونەتـــەوەیی کەنەتـــەوە یـەکگرتووەکان لـەجنێف لەساڵی 1955دا بەســتی بـۆ قـەڵاچۆکردنی تـاوان ومامەڵـەکردن لەگـەڵ گوناهبـاراندا، وروژێـنراو باسـی لێوەکـرا، لـەکۆتایی کۆنگرەکـەدا بەیاننامەیـەکیان دەرکـرد کەلــە (94) بنــەماو پرانسـیپ پێـك هــاتبوو بـــەناوی (بنـــەماکانی لانـــی کـــەمی مامەڵـــە کـــردن لەگـــەڵ بەندکراوەکاندا)وداوا لەهەموو وولأتانی دنیاکرا ڕەزامـەندی لەسـەر بنوێنـن وهـەموویان وەڵامـی داواکاریيەکـەیان دایـەوە وکـرا بەڕێبـەرێك بۆسیسـتمی چاککردن لەنێو بەندیخانەدا (بـەپێی ڕەوشـی یاسایی هەردەوڵـەتێك وبـاری ئابوریيەکـەی)(62). مامەڵـەکردنی ســزایی بەهاتنــە دەرەوەی بــەندکراو لەبەندیخانە کۆتایی نایەت بەڵکو بۆدواتریش لـەدەرەوەی بەندیخانـە درێـژە دەکێشێت بەمەبەستی بـەدوادا چونـی بەرنامـەی چاککردن وڕاهێنانـــەوەی ویارمەتی دانی لەڕووی مادیو سایکۆلۆژی يەوە.

## مامەڵە کردن لەناو دامەزراوە سزاییيەکاندا

هـــەروەك ئاشـــکرایە جێبـــەجێکردنی ســـزا هـــەردەم لەدامـــەزراوە سـزاییيەکاندا ئـەنجام دەدرێـت، بۆیــە بەچـەمکی نـوێی زانسـتی سـزادان لـــەڕووی کۆمەڵایەتیيـــەوە ئـــەبێ ئەومامەڵـــە کردنـــە لەســـەر بناغـــەی

پاكژكردنەوەو چارەسەر كردن وراهێنانەوەی بەندكراو بێت. لێرەدا ئاماژە بۆبەشەكانی ئەم مامەڵەكردنە دەكەین لەناو دامەزراوە سزاییەكاندا:

**یەكەم: پشكنین:**

پشكنین رێوشوێنێكە لەسەرەتای قۆناغەكانی جێبەجێكردنی سزادا پیادە دەكرێت، كارێكی تەكنیكییە و پسپۆری پزیشكیو دەروونی وكۆمەلأیەتی پێیهەڵدەستن. بەم شێوانە:

1- پشكنینی بایولۆژی: بریتییە لەپشكنینی پزیشكی گشتی بۆناسینی جەستەی بەند كراو، وتوانای جەستەیی وماسولكەییو، رادەی لەش ساغی ونەخۆشییەكانیو، جۆری نەخۆشییەكانیو، دیاری كردنی رێگاكانی چارەسەركردنی.

2- پشكنینی عەقڵی: بریتییە لەپشكنینی پزیشكی عەقڵی بۆ دەستنیشانكردنی حاڵەتی عەقڵی ودەماری (العصبی) بەندكراو، بۆدیاری كردنی نەخۆشی عەقڵی لەروی جۆرو پلەوە، هەروەها بۆ دیاریكردنی شێوازەكانی چارەسەر كردنی.

3- پشكنینی سایكۆلۆژی: بریتییە لە پشكنینی پزیشكی دەروونی بۆدیاری كردنی پلەی زیرەكی تاوانبار وحاڵەتی دەروونییەكەیو، نەخۆشیو گرێ دەروونییەكانی، هەروەها بۆچارەسەر كردنی پێویست.

4- پشكنینی كۆمەلأیەتی: بریتییە لەلێكۆڵینەوەی ژینگەی كۆمەلأیەتی بەندكراو: ژینگەی خێزانی، پەیوەندی بەژن (یان مێرد) و بەمنداڵ وهاورێو هاوكارەوەو، پیشەو پلەو ئاستی خوێندن و ئاستی رۆشنبیری، ئەم لێكۆڵینەوەیە درێژە دەكێشێ بۆ رابردووی بەندكراو (ژیانی خوێندنگاو شوێنی ئیشكردنی).

- پشكنینی ئـەزموونی: ئـەم لێكۆڵینەوەیـە كـارگێڕی بەندیخانــە ناوبــەناو بەســەر ڕەفتــاری بــەندكراوەكانیدا دەیكــات بــۆ دەستنیشـانكردنی هەڵوێسـتی بـەندكراو لەگــەڵ كارمــەندانی دامەزراوەكەو ڕادەی هاوكاری كردنــی لەگـەڵیانداو پــەیوەندی بەبـەندكراوەكانی تـرەوە، كاردانـەوەی بەرامبــەر بـە سیسـتمی تەنـهایی وكۆكردنـەوە وتێكـەڵاو، دیـاریكردنی ڕادەی جێبـەجێ كردنی ڕێنماییەكان یان بەرنامەكانی چاككردن(63).

**دووەم: پۆلێن كردن:**

پۆلێــن كــردن بریتیـیــە لەدابەشــكردنی بــەندكراوەكان بــۆ چــەند دەسـتەیەكی لەیـەكچووی هاوشـێوە لـەڕووی ڕەگـەزو تەمـەن وجـۆری تــاوان وجۆری سزاو ماوەی سزاو حاڵەتەكانی جەسـتەو دەروون وعـەقڵ و حاڵـەتی كۆمەڵایــەتیو وئەگــەری ڕاهێنانــەوە. پۆلێــن كــردن ڕاســتەوخۆ لــەپاش پشكنینەوە دێت وپشت بەو دەرئەنجامانە دەبەستێت كەلـە پشكنینەكانەوە دەكەونەوە(64).

پۆلێن كردن بەشێوازێكی بەرچاوی تاكێتی سزا دادەنرێت، چونكـە دوای دابەش كردنی بەندكراوەكان، بۆهەر دەستەو گرۆپێك ڕەفتـارو مامەڵەیـەكی تایبــەتی لەگــەڵیاندا دەكرێــت كــەبگونجێت لەگــەڵ بــاروزروف وكەســێتی تاكەكاندا(65).

**پۆلێن كردن دوو جۆرە:**

- ئاسۆیی: بریتـیـیە لەدابەشكردنی بەنكراوەكان بەسەر دامەزراوە سزایی جۆربەجۆرەكاندا بـەپێی پسپۆڕی وتایبەتمـەندێتی هەردامـەزراوێك وگونجان لەگەڵیدا.

- ستونی: بریتی‌یە لەدابەشــکردنی بـەندکراوەکان لـەنێو یــەك دامەزراوی سزاییدا بەسەر چەند دەستەو گرۆپێکدا.

### سێیەم: فێرکردن وپاکژکردنەوە:

لەپرۆسەی ڕاهێنانەوەدا فێرکردن وپاکژکردنەوە بەدووڕەگەزی سەرەکی دادەنرێن، چونکە بەهۆیانەوە چەندین سوودو کەڵك پێشکەش بەبـەندکراو دەکرێن، لەوانە: ڕزگارکردنیان لەنەزانین ونـەخوێندەواریو بەرزکردنـەوەی ئاسـتی هـزرو ڕۆشـنبیرییان و، تواناکـانی مێشــکیان پێدەگــات وگەشــەدەکات وبواری کارکردنیان بۆ باشتر دەکات، هەروەها گەشە بەباوەڕی ئاکاریو بـەها جوانـەکانیان دەدات ولـەناخیاندا بـڕواو متمانـە کـردن بـەخودو تواناکانیــان زیـاتر دەبێـت وئـەتوانن بەشـێوەیەکی دروسـت ڕەفتــار بکــەن وچارەســەری کێشەکانیان بکەن بەبێ ئەوەی ڕێگای تاوانکردن بگرنەوەبەر(66).

### بوارەکانی فێرکردن:-

پرۆســەی فــێرکردن لەدامــەزراوە ســزاییەکاندا ســێ شــێواز بــەخۆوە دەبینێت کەبریتین لە:-

1- فێرکردنی گشتی: مەبەست لـەو فێرکردنـە ڕێکخـراوو ڕێکو پێکەیـە کەلەلایـــەن دەوڵەتـــەوە ئـــەنجام ئـــەدرێت بەمەبەســـتی نەهێشـــتنی نــەخوێندەواری وپێدانــی زانســت وزانیــاری پێویســت لەســێ قۆناغەکــەی خوێندندا: سەرەتاییو ناوەندیو دواناوەندی. لەزانسـتی سزای نوێدا بـەلای کەمــەوە دەبێــت خوێندنـــی ســـەرەتایی زەرور بێـــت بـــۆ نەهێشـــتنی نــەخوێندەواریو دەبێـت بـەزۆر بێــت (تــەوزیمی) هــەروەها لەحاڵــەتی بـەندکردنی مـاوەدرێژدا دەبێـت بــەندکراو بــەردەوام بێـت ســەر خوێنــدن

وقۆناغی ناوەندیو دواناوەندیش تەواو بكات. لەسیستمی سزای فەرەنسیدا ئەگەر بەندكراو بڕوانامەی دواناوەندی بەدەست هێنا ئەوا دەتوانێت زانكۆش بخوێنێت وبواری بۆ بڕەخسێنرێت بۆ هێنانەدی ئەو حەزو هیوایەی. شایانی باسە خوێندنی قۆناغی سەرەتایی وسانەوەی دەبێت هاوشانی ئەو پرۆگرام وخوێندنە بێت كەلە خوێندنگە ئاساییەكانی تری دەوڵەتدا پەیرەو دەكرێن(67)، (68).

2- فێركردنی هونەری (پیشەیی): ئەو خوێندنەیە كەتیایدا بەنكراو فێری كارو پیشەیەك دەكرێت وەك ئاسنگەریو دارتاشیو بەرگدوورین وقژبڕین. ئەمڕۆ لەزانستی سزادا گرنگیو بایەخێكی تەواو بەم جۆرە خوێندنە دەدرێت بۆ ئامادەكردنی بەندكراو بۆ ژیانی پراكتیكی لەكۆمەڵگادا و، تاكو بتوانێت لەدژی بێكاری و مەترسییەكانی بوەستێت وخاوەنی پیشەیەك بێت بۆ بژێوی خۆیو خێزانەكەی(69).

3- چالاكی ڕۆشنبیری ووەرزشیو هونەری: هاوشانی خوێندنی گشتیو پیشەیی و، بۆكامڵ كردنی پرۆسەی خوێندن چەندین وانەو محازەرە بەزیندانی دەدرێت وكتێبخانەیان بۆدرست دەكرێت و كتێب وسەرچاوە لە: ئەدەب ومێژوو وكۆمەڵناسیو دەروونزانیو یاسا وئاكارو .. تاد، دەستەبەر دەكرێت سەرەڕای دابەشكردنی ڕۆژنامەو گۆڤار وبلاْوكراوە ڕۆشنبیرییەكان بەسەر زیندانییەكاندا. هەروەها دەبێت گرنگی بەچالاكی وەرزشیش بدرێت ومەشق وڕاهێنانیان پێبكرێت وتیپی وەرزشییان لێ دروست بكرێت (تۆپیپێ، باسكە، تۆپی سەرمێز، بالە). چالاكی هونەریش نیگاركێشان وپەیكەرتاشین ومۆسیقا.....تاد دەگرێتەوە.

**بوارەکانی پاکژکردنەوە:**

1- بواری ئایینی: لێرەدا زیندانی فێری بنەماو یاساکانی ئایینی رەسمی خۆی دەکرێت، سەبارەت بەپەیوەندی مرۆڤ بەیەزدان وبنەماکانی راستگۆیی وخۆشەویستی وئاسایش وئاشتیو، هانبدرێت بۆ پیادەکردنی سروتە ئایینییەکان. ئەم کارەش مامۆستاو زانایانی ئایینی پێیهەڵدەستن ودەبێت ئەو مامۆستایانە سەرەڕای شارەزاییان لەبواری ئاییندا زانیاریشیان لەیاساو مەبەستەکانی جێبەجێکردنی سزاکاندا هەبێت وهەل ومەرجی تاوانکردن بزانن ولەبارەی کۆمەڵناسیو دەروونزانیشەوە وەکو پێویست زانیاریان هەبێت، شایانی باسە کارگێڕی بەندیخانە بۆی نیە ئایینێکی دیاریکراو بەزۆر بەسەر بەندکراوەکاندا بسەپێنێت کەئایینی راستەقینەی بەندکراوەکە نەبێت وهەروەها شوێنی تایبەتی بۆمەبەستی ئەنجامدانی سروتە ئایینییەکان دابمەزرێنێت(70). لەهەندێ دامەزراوی سزاییدا مەسەلەی پاکژکردنەوەی ئایینی وەك بەرنامەی ڕاهێنانەوە پەیڕەو ناکرێت چونکە پێیان وایە دژ بەئازادیو بیروباوەڕی مرۆڤە.

2- پاکژ کردنەوەی ئاکاری: بریتییە لەپرۆسەی چاندنەوەی بەها ئاکارییەکان لەناخی زیندانیدا وگەشەپێدانی گیانی هاوکاری وهەرەوەزی، هەروەها فێری بنەماکانی ڕاستگۆیی ودەستپاکیو خۆشەویستی دەکرێن بۆ پاراستنی پایەکانی کۆمەڵگا. ئەم کارەش هەردەم پسپۆڕانی کۆمەڵناسی ودەروونزانی پێی هەڵدەستن لەڕێی وانەو محازەرەو کۆڕو کۆبوونەوە کردن بەزیندانییەکان، یان بەشێوەی تاکایەتی(71)، (72).

## چوارەم: كاركردن:

كـاركردن لەبەنديخانــەكاندا گرنگــترين شـێوازی مامەڵـەكردنی ســزايە كەئـەمڕۆ لەپرۆسـەی ڕاهێنانـەوەدا پـەنای بۆدەبرێـت و، لەوكاتـەوەی كـاری پێدەكرێت وپەيوەست كراوە بەسزای زەوتكردنی ئازادیيــەوە بـەڵام ئـەمڕۆ جۆرو وئامانجەكانی جياوازن لەوەی جـاران، لەپێشـدا كەرەسـەيەك بـووە بـۆ ئەشـكەنجەو ئـازاردان و، بــەندكراو قورســترين وســەخترين كـاری پێكـراوە ياخود ڕەوانەی (ناوچە داگيركراوەكان) كراوە، بەڵام ئێستا لەچەمكی نوێی ســزادانـدا ئــەو بيرۆكەيـــە نــەماوەو كــراوە بەشــێوازێك بۆســەر لــەنوێ ڕاهێنانەوەی بەندكراو(73).

## مەبەستەكانی كاركردن:

گەرچی بەپێی بەرنامەو پرۆگرامـی دامـەزراوە سـزاييیەكان مەبەسـتی كاركردن دەگۆڕێت ومەرامی جياواز بــەخۆوە دەگرێـت، لێرەدا بەشـێوەيەكی گشـتی ئامـاژە بـۆ چـوار لـەو مەبەسـتانە دەكـەين كـەبريتين لـە: سـزادان، ڕاهێنانەوە، كارگێڕی وبەرهەم هێنان.

أ- <u>كارپێكردن وەك سزادانی بەندكراو:</u>

هـەتا ئـەمڕۆش لەزۆربـەی ياسـاكانی وڵاتـانی جيـهانـدا كــاركردن بەســزا هـەژمار دەكرێـت وپەيوەسـتە بەسـزای زەوتكردنـی ئازادیيـەوە وەك: سـزای كـاری قـورس وسـەخت، يـان بــەندكردن لەگــەڵ كـارپێكردنـدا، لـەنێو ئـەو ياسايانەدا كەبە سزای دادەنێن ياسای ميصری (مادەی 14 ی ياسـای سـزاكان) سوريا (مادەی 45 ی ياسای سزاكان)(74).

ب- کارکردن وەك ڕاهێنانەوە بەندکراو:

ئـەمڕۆ زانسـتی سـزاکان لەپرۆسـەی ڕاهێنانـەوەدا جـەخت لەسـەر ڕۆڵـی کـارکردن دەکاتـەوە، چونکـە چـەندین بەرئـەنجامی گرنگـی لێ دەکەوێتـەوە لەوانەش:-

1- کـارکردن مەشـق پێکـردن وڕاهێنــانی بـەنکراوە لەسـەر پیشـەیەکی دیـاری کـراو کەلەگـەڵ حـەزو ئـارەزوویدا بگونجێـت ویارمـەتی بـدات بـۆ دابینکردنی گوزەران وبژێوی لەدوای ئازاد بوونی‌یەوە. ئینجـا بۆئـەوەی ئـەم ئەنجامــە بەباشــترین شـێوە بــەدی بــهێنرێت پێویســتە لەبەندیخانــەدا لیژنەیــەکی تــەکنیکی وکــارگێڕی بۆئــەو مەبەســتە پێکبــهێنرێت بــۆ دەستنیشـانکردنی ئـەو کـارەی لەگـەڵ بەندکراوەکـەدا دەگونجێـت، لێرەشـدا کارەکـان هەمـەجۆر دەکرێـن بۆئـەوەی دەرفـەتی گونجـاو بـۆ هەریـەکێکیان بڕەخسـێنرێت، جگـە لەجـەخت کردنــەوە لەسـەر بەرهــەمداری کارەکــە بەشێوەیەك وەك ئەو کارانەبێت لەکۆمەڵگای دەرەوەی بەندیخانەدا بوونیـان هەیەو تا کەسەکە لەدوای ئازادکردن کاری گونجاو بۆخۆی بدۆزێتەوە.

2- کـارکردن بـەندکراو دوردەخاتـەوە لـەوەی ببێـت بـەنێچیری بێکـاریو دەرهاویشتەکانی (وەك نەخۆشی جەستەیی وپەشێوی دەروونی).

3- کـارکردن بــڕواو متانــە لــەناخی بەندکراوەکـەدا دەچێنێتــەوە ووای لێدەکــات هەســت بکـــات ئــــەندامێکی بەکـــەڵك وکرێکارێکـــە لـــەدەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکاندا.

4- ئەشـێت ئـەو کـارەی بـەندکراو دەیکـات ببێتـە سـەرچاوەیەکی مـاددی بۆدابینکردنـی بژێـوی خـۆی وخێزانەکـەی و، خۆئەگـەر کـرێی کارەکەشـی پاشەکەوت بکات ئەوا دەتوانێت خەرجی‌یەکانی دوای ئازاد بوونی پێیدابـین بکات(75).

ج- پاراستنی سیستم:

زاناكانی سزادانان پێیان وایه كاركردنی بەندكراو بەشداریكردنێكه لەپاراستنی سیستم وئاسایشی نێو دامەزراوه سزاییەكان، چونكه كاتی بێئیشی درێژخایەن پاڵ بە بەندكراوەوه دەنێ وهانی دەدات بۆبیركردنەوه لەبارو ڕەوشی خۆی وئەو نائازادییەی كەتیایدا دەژی، ئەشێت ئەو یاسایانەی لەناو بەندیخانەدا جێبەجێ دەكرێن یاخود هەڵوێستی سەرپەرشستیارو دەرگاوان (سجان) گیانی تۆڵەو ڕق وكینەو تورەبوون لەناخیدا بچێنن ودواتریش ڕووبكەنه ئاژاوه نانەوه ویاخی بوون وسەرپێچی كردن بەتایبەتی لەوكاتانەدا كەهاوكارەكانیان هەمان هەست ووەڵام دانەوەیان هەبێت(76).

د- بەرهەم:

كاركردن لەناو بەندیخانەدا كەرەسەیەكه بۆ بەرهەم هێنان وهاوبەشیكردن لەبیناى ئابورى نەتەوەیی دا كەدەشێت بڕێك قورسایی دارایی لەئەستۆی دەوڵەت دوربخاتەوه، ئەویش بەداپۆشینی خەرجییەكانی بەندیخانه جگه لەدەستكەوتنی قازانج. ئاشكرایه گرنگترین عەیبی بەندیخانه لەوەدایه خەرجییەكانی گەورەیه بۆ بودجەی دەوڵەت، سەرباری بێكاربوونی ژمارەیەكی گەوره لە هاووڵاتییان كەبێ بەرهەمن ولەبەندیخانەدان، كاركردنی بەندكراو بۆخۆی چارەسەری ئەم عەیبە دەكات(77)، (78).

**پێنجەم: چاودێری تەندروستی:-**

چاودێری تەندروستی لەناو بەندیخانەدا پێویستییەکی زەرورییە لە پرۆسەی ڕاهێنانەوەدا چونکە چارەسەرکردنی نەخۆشییە جەستەییو عەقڵیو دەروونییەکان وسەرپەرشتی کردنی باری تەندروستی، هەردوکیان بەشداری دەکەن لەئامادەکردنی بەندکراودا بۆ قبوڵ کردنی پەیڕەوو بەرنامەی بەندیخانەو کارلێك کردن لەگەڵیدا، هەروەها بۆفێربوون وپاکژکردنەوە وکارکردن، ئەمانەو جگە لەوەی بەندکراو وای لێدێت هەست بەوە بکات وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت وبڕواو متمانەی بەخۆی وکۆمەڵگاکەی بۆ دەگەڕێتەوە شێوازەکانی چاودێری تەندروستی بەسێ شێوە دەکرێت: خۆپاراستن، چارەسەرکردن وخواردەمەنی(79).

**1- خۆپاراستن:**

یەکەمین مەرجی خۆپاراستن لەنەخۆشی خۆی لەبینایەی بەندیخانەدا دەبینێتەوە کەبەشێوەیەکی هونەریو ئەندازەیی دروست بکرێت وشوێنەکانی نوستن وکارکردن و هەوا گۆڕی تیادا گونجاو بێت وتیشکی خۆر بچێتە هۆڵەکانەوە وهەواکەی ناوی بگۆڕێ وگەرماو ئاودەستخانەکانی مەرجی تەندروستییان تیا ڕەچاو بکرێت(80). دەبێ هەموو شوێنێکی ناو بەندیخانە کە بەندکراو تێدەکرێت ئەم دوومەرجەی تیادا بێت:

أ- پەنجەرەکان گەورەو فراوان بن تا ڕوناکی تەواو بێتە ژورەوە وبواری خوێندنەوە بدات وهەوای پاکیش گوزەر بکات یان هەوا گۆڕی تیادا دابنرێت.

ب-پێویستە ڕووناکی دەستکرد (گڵۆپ) وەك پێویست دابمەزرێ وئەوەندە تیشك بدات کە ڕێگا بەخوێندنەوە وکارکردن بدات وزیان لەچاوو توانای بینین نەدات.

هەروەها لەپرۆسەی خۆپاراستندا دەبێت چاودێری تەندروستی ورد بەسەر بەندکراوەکاندا بسەپێنرێت وپشکنینی پزیشکی بەردەوامیان بۆ بکرێ ونەخۆشەکان بەزوترین کات ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێن دوربخرێنەوە. جگە لەڕاگرتنی پاك وخاوێنی جل وبەرگ وپیخەف وجەستە، سەبارەت بەجل وبەرگ پێویستە هەموو بەندیەکان یەك بەرگی چون یەك بپۆشن ونابێت بەرگی تایبەتی وجیاجیا لەبەر بکەن، ودەبێت بەپێی کەش وهەوا (سەرماو گەرما) جل وبەرگیان بدرێتێ وناوبەناو بشۆرێن، وپێویستە هەر بەندکراوێك جێگاو پێخەفی سەربەخۆی هەبێ وپاك وخاوێن ڕایبگرێ ولەسەر پاك وخاوێنی جێگەکەی لێ بپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت(81)، (82).

2- چارەسەرکردن:

چارەسەرکردنی نەخۆشی بەندکراو مافێکی ڕەوای خۆیەتی چونکە:

أ- ئازاد نیە سەردانی دکتۆری تایبەتمەند بکات.

ب- وەك هەرمرۆڤێکی تر مافی تەندروستی جەستەو عەقڵ ودەروونی هەیە(83).

چارەسەرکردن پێویستە بەخۆڕایی بێت ولەئەستۆی دەوڵەتدا بێت لەبەرئەوەی بەشێکە لەپرۆسەی ڕاهێنانەوەو، دووەم لەبەر باری ئابوری نزمی بەندکراو کەتوانای دانی خەرجی چارەسەرکردنی نیە. چارەسەرکردنی نەخۆشی پێویستی بەوەیە نەخۆشخانە لەنێو زیندانەدا

بکرێتــەوە ولەپزێشــکێك زیــاتری تێــدا بێــت (بەبــەردەوامی) ســەرەڕای دەستەبەر کردنی دەرمان وپێداویستی‌یە پزیشکی‌یەکان(84).

3- خواردەمەنی:

پێدانــی خواردەمــەنی بەبــەندکراوەکان مــافی خۆیانــە ولەئەســتۆی دەوڵەتدایەو، کارگێڕی زیندان پێی هەڵدەستێت، خواردنــی گونجــاو لــەڕووی چــەندێتی‌و چۆنیەتی‌یــەوە، خۆئەگــەر بــاری تەندروســتی بــەندکراوێکی نەخۆش پێویستی بەخۆراکی تایبەتی هەبێت پێویستە کارگێڕی بەندیخانــە بۆی ئامادە بکات (85).

دەبێت لێپرسـراوانی ئـەم کـارە پەیوەسـت بـن بـەپاکو خـاوێنی خـۆراك وقـاپ وکەرەسـەکانی خواردنـەوە وهــەروەها لــەکاتی گونجــاودا لەشــوێنێکی تایبــەتدا (چێشــتخانەی زینــدان) ببیــاندرێتێ ئەگــەر بگونجێــت، وپێویســتە ئاوی پاکی خواردنەوەیان بۆ فەراهەم بکرێت(86).

## شەشەم: چاودێری کۆمەڵایەتی:

مەبەست لەچاودێری کۆمەڵایەتی، یارمەتی دانــی بــەندکراوە بــۆ ڕاهــاتن لەگــەڵ ژیــانی نــاو بەندیخانــەداو، بتوانێــت بەســەر کێشــە شەخســی‌و خێزانیــەکانیدا زاڵ بێــت و، کــاربکرێت بــۆ درێــژەدان بەپەیوەندی‌یــەکانی بەکۆمــەڵگاوە، چونکــە گواســتنەوە بۆکــەش وهــەوای بەندیخانــە کودەتایــەکی گــەورەو تــەواوە لــەژیانیدا، بەتایبــەتی ڕۆژەکــانی یەکــەم تــەواو زەحمــەت ودژوارن وپــڕن لەپەشــێوی‌و دڵــەڕاوکێ وئەشــکەنجەی دەروونــی، ئــەوەش کــەزیاتر ژیــان وکێشــەکانی ســەخت دەکات بوونــی ژن ومنداڵــە، یــان بوونــی نەخۆش وکەم ئەندام ئەوکەسانەیە لەماڵدا بەجێی هێشتوون و پێویستیان بەمــە، یــاخود کــارە بازرگانیەکەیــە کەئــەم بەرســێوەی دەبــات، یــان ئــەو

کێشــانەیە کەئــەم بەچارەســەرنەکراوی بــەجێ ی هێشــتوون. زۆربــەی ئامارەکــانی ئــەم بــوارە دەریانخســتووە حاڵەتــەکانی خۆکوشــتن لــەنێو بەندیخانــەدا لەســەرەتای ســزاداندا ڕوودەدەن بــەهۆی دارمــانی دەروونــی ونـائومێد بوونـی قـورس وتوندوتیـژەوە چونکـە بـەندکراو هیـچ هیوایـەکی بــەئاییندە نــامێنێ ولەدەســتی دەدات، بۆیــە هاوکــاری کــردن وپشــتگیری بەندکراو ودڵدانەوەی لەڕۆژەکانی یەکەمی بەندکراودا، بەشـداریەکی گـەورە دەکەن لەسەرخستنی بەرنامەکانی ڕاهێنانەوەدا(87).

### شێوازەکانی چاودێری کۆمەڵایەتی:-

1- توێژینەوەی باری کۆمەڵایەتی بەندکراو:

ئەم توێژینەوەیە بارو زروفی کۆمەڵایەتی وئابوری بەندکراو دەگرێتەوە لەسـەرەتای لـەدایك بوونیـەوە تائـەو کاتـەی خراوەتـە بەندیخانــەوە، ئەمـە پێویســتی بەگرتنەبــەری چــەندین ڕێوشــوێن هەیــە وەك: چاوپێکــەوتن لەگەڵیدا بەشێوەی تەنهایی لەکەشێکی هێمــن وئـارامدا، پاشـان سـازدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ خێزان وهاوکارو مامۆستاکانی قۆناغەکانی خوێندنیـدا، هــەروەها چاوخشـاندن بەدۆسـیەی کەسـێتی‌دا (لێکۆڵینــەوە قەزائی‌یــەکان وکارگێریی‌یــەکان و، بەڵگەنامــەی تایبــەت بــەخێزان و کاروپیشــەو پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی وچالاکی‌و پێشـینە قەزائی‌یـەکانی، جگـە لـە لێکۆڵینـەوەی نـوێ بـۆ دۆزینـەوەی لایەنـە شـاراوەکانی ڕابـردووی کەسـێتی. سـەرباری لێکۆڵینــەوە لەکێشـە خـێزانی‌و پیشـەیی وئـەو بـارە ئابوری‌یـە کەبەسەریدا دێت لەوکاتەوەی خراوەتە بەندیخانەوە(88).

ئەم توێژینەوانەش پسپۆری کۆمەڵناسی پـێ ی هەڵدەستێت بـەهاوکاری پسپۆرانی تـرو ڕاوێـژ پێ کردنیـان، یەکـەمین ئـەرکی پسـپۆری کۆمەڵایـەتی

زامنكردنی بڕوای بەندكراوە بەقبولْ كردنی ژیانی نوێی لەبەندیخانەدا، هەروەها بەرزكردنەوەی مۆراڵی (معنويات)، دورخستنەوەی ترس ودودڵی لێ‌ی‌و، یارمەتی دانی بۆ چارەسەركردنی كێشە هەمەجۆرەكانی بەتایبەتی كێشەی ئابوری وخێزانی دەرەوەی زیندان، هەروەها ئەركی پسپۆری كۆمەڵایەتی‌یە بەدوادا چوونی هەبێت بۆ پەیوەندیەكانی بەبەندكراوەكانی ترەوەو، ئەو گۆڕانكاری‌یە كتوپڕیانەی ڕوودەدەن، لەگەڵ هاوكاری كردنی لیژنە تایبەتمەندەكان بۆ دارشتنی پەیڕەو وپرۆگرامی سەرلەنوێ ڕاهێنانەوە یان گۆڕینی ئەو پرۆگرامە ئەگەر پێویست بكات.

2- ڕێكخستنی كاتەكانی بێئیشی:

كاتی بێئیشی بەمەترسیدارترین كێشەی بەندكراو دادەنرێت بۆیە لەنێو ڕەگەزەكانی ڕاهێنانەوەدا گرنگترینیانە، ئەبێ ئەوكاتانە بەچالاكی ڕۆشنبیری وهونەری ووەرزشی‌یەوە.... بەسەر ببرێت، لێرەدا ڕۆڵی توێژەری كۆمەڵایەتی یارمەتی دانی بەندكراوە بۆ هەڵبژاردنی ئەو چالاكی‌یەی لەگەڵ حەزو هیواو ئارەزوەكانی بەندكراودا دەگونجێت.

3- ڕێكخستنی پەیوەندی بەجیهانی دەرەوە:

دەبێت بەندكراو پەیوەندی نەپچڕێت بەجیهانی دەرەوەی زیندان، ئەم مەرجەش لەبەر دووهۆ لەپرۆگرامی ڕاهێنانەوەدا دانراوە:

أ- بەردەوام بوونی پەیوەندی بەندكراو بەخێزانەكەیەوە، ئەوهەستەی تیادا دروست دەكات كەهێشتا هەر ئەندامە تیایدا وئاگای لەكاروباریانە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا لەڕووی دەروونی‌یەوە ئاسودەی دەكات.

ب- لەبەر ئەوەی ڕۆژێك دادێت بەندكراو دەگەڕێتەوە بۆنێو ژیانی كۆمەڵایەتی ئاسایی، بۆیە دەبێت بۆئەو گەڕانەوەیە ئامادە بكرێت ئەویش

لـەڕێی پتـەوکردنی پەیوەندیـیـەکانی بـەدەرەوەی بەندیخانـەوە، بۆئـەو مەبەسـتـەش دەبێـت چاوپێکـەوتنی لەگـەڵ خـێزان وهاوڕێکـانیدا بـۆ سازبکرێت، ڕێگای بدرێ ئاڵوگۆڕی نامە بکـات یـاخود لـەڕێی سازدانی یـاری کردنی وەرزشیـیەوە، (تیپی وەرزشی بەندیخانـە لەگـەڵ تیپـە وەرزشـیـەکانی دەرەوەدا)، هەروەها ئاهەنگ ودرامـاو چالاکی هونـەری ساز بدرێت وتیـایدا کەسانی دەرەوەی بەندیخانە بەشداری بکەن.

هـەروەها لەهـەندێ بەندیخانـەدا ڕێگـا دەدرێـت بـەندکراوەکان لەکارەساتەکانی وەك لافاو وجەنگ وبومەلەرزە.... کاری فریاگوزاری ئـەنجام بـدەن. یـاخود لـەڕێی پێدانـی مۆڵـەت بـۆ ڕۆژێـك یـان دوو ڕۆژ تابـەندکراو بێتە دەرەوەی زیندان لەکاتی جـەژندا یـاخود نەخۆشـی وهاوبەشـی کردنـی لەپرسەی کەسێکی پلە یەکیدا(89).

## مامەڵە کردن لەدەرەوەی دامەزراوە سزاییەکان

مەسـەلەی سـزادان ومامەڵەکردنی بـەندکراو بەگشـت شـێوازەکانییەوە تەنـها لـەناو دامـەزراوە سـزاییەکاندا تـەواو نـابێت وکۆتـایی نایـەت، بـەڵکو چـەندین شێوەی ئـەو مامەڵـە کردنـە لـەدەرەوەی دامــەزراوەکاندا ئــەنجام دەدرێــت. پراکتــیزە کردنـــی شـــێوازەکانی مامەڵـــەی ســـزایی لـــەدەرەوەی دامەزراوەکاندا، بەسەر کەسی بەندکراودا لـەدوو حاڵـەتدا دەکرێـت وئـەنجام دەدرێت:

یەکەم: بەبێ جێبەجێ کردنی سزادان، لەم حاڵەتەدا بەندکراو پێویست ناکات بخرێتە نێـو بەندیخانـەوەو، مامەڵەکردنەکـە لەدەرەوەی بەندیخانـەدا پرۆسـەی چاککردن بەئـەنجام دەگەیـەنێت، نموونـەی ئـەم جـۆرە مامەڵـە کردنەش (هەڵپەساردنی سزاو تاقیکردنەوە) یە.

دووەم: لەدوای جێبەجێکردنی بەشێك یان هەموو سـزاکەوە دێت، واتـا دوای ئـەوەی بـەندکراو لەدامـەزراوە سـزاییەکە دێتـە دەرەوە، مەبەسـت لەمـەش تـەواوکردنی بەرنامـەی چاککردن ودوبـارە ڕاهێنانـەوەی بـەندکراو یان تاوانبارەکەیە، نموونەی ئـەم حاڵەتـەش پـاڕۆڵ وئـازادکردنی مـەرجدارو بـەدوادا چوونـــی چـــاودێریکردن (الرعایـــە اللاحقـــە: چـــاودێری کـــردن لەئاییندەدا).

**بەشی یەکەم: هەڵپەساردنی سزای سەپێنراو:**

بریتی‌یە لەهەڵپەساردنی جێبەجێکردنی سزا لەهەلو مەرجێکی دیاریکراودا کەقانون خۆی دەست نیشانی دەکات. ئەمەش یەکێکە لەشێوازەکانی مامەڵەکردنی سزایی ودادگا بۆسزا ماوە کورتەکان پەنای بۆ دەبات، بۆئەوەی حوکمدراو تێکەڵ بەژینگەی گەندەڵ وخراپی بەندیخانە نەکرێت، ئەگەر دادگا باروزروف وپێکهاتەی کەسێتی بەندکراوەکەی ڕەچاوکرد، ئەودەمە ئەم ڕێوشوێنە دەگیرێتەبەر، تەنها هەڕەشەی جێبەجێکردنی سزا ئەوەندەی لەبارداییە کەجارێکی‌تر تاوانبارەکە لەماوەیەکی زەمەنی دیاری کراو بەتاوانی تر هەڵنەسێتەوە(90).

ئەم شێوازە سزایی‌یە دوو بیرۆکەی سەرەکی لەخۆ دەگرێت کەبریتین لە: بیرۆکەی سزادان وبیرۆکەی پاداشت کردن، ئەم دوو بیرۆکەیە هەردووکیان بەیەکەوە هاوبەشی دەکەن لەخولقاندنی ئیرادەی چاککردن وڕاهێنانەوەی حوکمدار وگەڕانەوەی بۆ ڕەفتاری چاك لەڕووی کۆمەڵایەتی‌یەوە(91).

لێرەدا دادگا بڕیارِی قەزائی خۆی دەردەکات بەتاوانبارکردنی تۆمەتبار بەوەی کەتاوانی ئەنجام داوە وسزاکەش دەسەپێنێت بەسەریدا، لەهەمان کاتدا ئەو بڕیارە ئەوەشی تێدایە کەجێبەجێ کردنەکەی بۆماوەیەکی زەمەنی دیاری کراو ڕابگرێت.

## مەرجەکانی هەڵپەساردنی سزا:

زانستی سزاو یاساکانی سزاکان چەندین مەرجی دیاریکراویان دەستنیشان کردووە کەپێویستە لەتومەتبار وتاوان وسزاکەدا هەبن بۆئەوەی جێبەجێ کردنی سزاکە ڕابگیرێت و بریتین لەمانە:

<u>یەکەم: مەرجەکانی تایبەت بەتۆمەتبارەوە:</u>

مەرجی سەرەکی لەهەڵپەساردنی سزادا بریتی‌یە لەئەگەری بەهێز بۆسەر لەنوێ ڕاهێنانەوەی حوکمدراو بەبێ ئەوەی پێویست بەجێبەجێکردنی سزا بکات، واتە کەسێتی حوکمدار ولەوجۆرانەیە کەدەکرێت چارەسەربکرێت بەبێ ئەوەی بخرێتە نێو دامەزراوی سزایی‌یەوە(92). لەم حاڵەتەدا دادگا بۆی هەیە بڕیاربدات سزاکەی ڕابگرێت ئەگەر بۆی دەربکەوێت ڕابردووی تۆمەتبار وئاکارو تەمەن و، ئەو باروزروفەی تاوانەکەی تیادا ئەنجام داوە، ئاماژەن بۆ سەلماندنی نەگەڕانەوەی تاوانبار بۆ تاوانکردن، ئەم مەرجەش پێویستی بەوە هەیە کە دادوەر بڕیاربدات پشکنین وتوێژینەوە بۆ کەسێتی تاوانبارو ڕەوشی ژیانی پێش تاوانکردن ودوای تاوانەکەی بکرێت، سەرباری پێشینی کردنی ئەوبارو زروفەی کەدەشێت لەماوەی ڕاگرتنی جێبەجێکردنی حوکمەکەدا سەرهەڵبدەن. هەروەها دەبێت حوکمدراو بەڵێن بدات کەناگەڕێتەوە بۆتاوانکردن، خۆئەگەر دادگا بەپێویستی زانی ئەوا دەبێت کەفالەتی شەخسی یان ماددی بدات(93).

دووەم: مەرجەكانی تایبەت بەتاوانەوە:

هەندێك لەیاساو تەشریعەكان بۆ هەموو تـاوانێك (ئیـتر لەهـەر جۆرێـك بێت) بڕیاڕی هەڵپەساردنی سزا بەپێویست دەزانن، بەلاّم هـەندێ یاسا ئـەم بڕیـارە لەتاوانـەكانی دژ بـەئاكار وئـادابی گشـتی ونـاموس وتـاوانی ئـابوریو دزینی پارە وموڵكی دەوڵەت، دووردەخەنەوەو دەڵێن نـابێت شمولیـان بكـات. لەم بڕگەیەدا جیاوازی لەنێوان یاساو تەشریعی ولاتاندا هەیە(94).

سێیەم: مەرجەكانی تایبەت بەسزاوە:

زۆربــەی یاســاكانی وولاتــان بڕیــاڕی هەڵپەســاردنی ســزا دەبەســتنەوە بەسزای زەوتكردنی ئازادیيەوە كەماوە زەمەنیەكەی كورت بێت. بۆنموونـە لەیاسای ئەڵمانیدا (نۆمانگ) ولەیاســای میصـریدا (شـەش مـانگ) ولەیاسـای سوری وبەلجیكیدا (سێسال) ولەیاسای فەرەنسیدا (پێنج سال) دیـاریكراوە ئــەم یاســایانە پێبژاردنیــش دەگرێتــەوە، بــڕی ئەوپێبژاردنـــەش بـــەپێی یاساكانی وولاّتان دەگۆڕێت(95).

## شوێنەوارەكانی هەڵپەساردنی سزا:

یەكەم: حوكمدراو بخرێتە ژێر تاقیكردنەوەوە:

لـەكاتی هەڵپەساردنی سـزادا، حوكمـدراو بـۆ ماوەیـەكی زەمـەنی دیــاری كراو دەخرێتە ژێر چاودێری تاقیكردنەوەوە، ئەو ماوە زەمەنیيە لەهەردوو یاسای فەرەنسیو سوریدا پێنج ساڵە ولەیاسای میصــری وكوێتـیدا سێسـاڵە، لەوكاتـەوە هـەژمار دەكرێـن كەحوكمەكـە دەبـێ جێبــەجێ بكرێـت (بـەلاّم جێبــەجێ كردنەكــە ڕاگــیراوە) لــەوماوە زەمەنیيــەدا ســزاكە بەســـەر

حوكمدارەکـەدا جێبـەجێ نـاکرێت، بـەڵام هـەردەم لـەژێر هەڕەشـەی جێبەجێکردنی حوکمەکەیدا دەژی.

لەزۆربەی یاساکانی وولاتاندا حوکمدراو ناخرێتە ژێر هیچ جۆرێك لەچاودێریو ئاراستەکردنەوە وازی لێ دەهێنرێت خۆی هەوڵی چاککردنی ڕەفتارەکانی بدات بەڵام هەندێ یاسا وەك یاسای ئەڵمانی بەپێویستی دەزانێت هاوکارییەکی پۆزەتیفانە بکرێت بۆ سەرلەنوێ ڕاهێنانەوەی حوکمدراو ئەمەش بەوەی هەندێك ئەرك ووابەستەبوون بخرێتە ئەستۆیەوە یاخود کەسێك دەسنیشان بکرێت بۆ یارمەتیدانی لەئاراستەکردن وسەرپەرشتیکردندا.

<u>دووەم: هەڵوەشانەوەی هەڵپەساردنی سزا یاخود کۆتایی هاتنی ماوەی تاقیکردنەوەکە:</u>

ئەگەر حوکمدراو لەکاتی تاقیکردنەوەکەدا تاوانێکی نوێ ئەنجام بدات وبەڵگەیەکی وەها بەدەستەوەبدات کەلەدەرەوەی دامەزراوە سزاییەکاندا ڕانایەتەوە وچاك نابێت، لەم حاڵەتەدا دادگا بۆی هەیە چاو بخشێنێتەوە بەوروشەدا وئەتوانێت بڕیار بدات بەهەڵوەشانەوەی بڕیارەکەی پێشوی (کەهەڵپەساردنی سزاکەیە) هەروەها ئەشتوانێت هەلێکیتر بەحوکمدراو بداتەوە بۆچاککردنی ڕەفتارەکانی ئەگەر دادگا گەیشتە ئەو باوەڕەی کەئەم تاوانە نوێیە ئەوەندە ناهێنێت کە گۆڕانکاری بەسەر شێوازی مامەڵەکردنی سزاییەکەی پێشوویدا بهێنرێت.

لەحاڵەتێکی تریشدا بڕیاری هەڵپەساردنی سزا هەڵدەوەشێنرێتەوە ئەگەر دادگا بڕیاری بەندکردنی حوکمدراو دەربکات بەهۆی تاوانێکەوە کەلەپێش بڕیاری هەڵپەساردنەوە ئەنجامی داوەو، دادگا بێئاگا بووە لێی لەکاتێکدا کەبڕیاری هەڵپەساردنەکەی دەرکردوە، یاخود ئەگەر دەرکەوت

کەبڕیاری بەندکردنی حوکمدراوەکە دەرکراوە لەپێش بڕیاڕی هەڵپەساردنی سزاداو دادگا بێئاگایە لێی.

لەهەموو حاڵەتەکاندا ئەگەر دادگا بڕیاڕ بدات بەهەڵوەشاندنەوەی بڕیاڕی هەڵپەساردنی سزا، ئەوا حوکمدراو دەبێت سزا ڕاگیراوەکەی وسزای تاوانە نوێیەکەی بچێژێت.

خۆئەگەر ئەو ماوە زەمەنی‌یەی کەتاقیکردنەوە وئەزموونە بۆ حوکمدراوو دیاری کراوە بۆهەڵپەساردنی سزاکەو، بەشێوەیەکی ئاسایی تێپەڕی وهیچ هۆیەك نەبێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی بڕیاڕی هەڵپەساردنی سزا، بەواتایەکی‌تر حوکمدراو تاقیکردنەوەکەی بەسەر کەوتوویی تێپەڕاند، ئیتر هیچ بڕوبیانووپاساوێك نامێنێتەوە بۆ بەردەوام بوونی هەڕەشە لێکردنی حومکدراو بەجێبەجێکردنی ئەوسزایەی کەڕاگیراوەو، دەبێت بەهاوولاتی‌یەکی ئاسایی(96).

**بەشی دووەم: تاقیکردنەوە:**

**تاقیکردنەوە(97) وەك پێناسە: شێوازێکە لەمامەڵەکردنی سزایی، بەسەر تومـەتبار یـان حوکمـدراودا جێبەجێـەکرێت، ، بەمەبەسـتی ڕاهێنانــەوەی لەماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا، ئەم شێوازە پابەندە بــەکۆت وبـەندکردنی ئازادی ئەو کەسەی کەدەخرێتە ژێر تاقیکردنەوەوە بەڕێگایەك کەهـەندێك وابەســـتە بـــوون بخرێتـــە ئەســـتۆیەوەو(98)، کەســـێك ڕادەســـپێردرێت سەرپەرشــتی بکـات ویارمــەتی بـدات، خۆئەگـەر ئـــەوماوە دیــاریکراوەی تێپەڕاندبوو ئەستۆ پاکی دەرخست لەوابەستەبوونەکانیدا، ئەودەمە تۆمــەت یان حوکمەکەی هەڵدەوەشێتەوەو هەڵدەگیرێت، بەڵام ئەگەر لـەوماوە دیـاری کــراوەدا نــەیتوانی ئەســـتۆپاکی خــۆی بەرامبــەر بــەو وابەســـتەبوونانە بسەلمێنێت ئەوکاتە دادگا بۆ پراکتیزە کردنی داوانامەکـە ئـازادی لەکەسـەکە دەســەنێتەوە یــاخود بڕیــاردەدات بەجێبــەجێکردنی ئــەو حوکمــەی کـــە ڕایگرتووە ونەیهێشتووە جێبەجێ بکرێت، واتە ئەو بڕیارەی کەپێشتر دەری کردووە جێبەجێی دەکات(99).**

**ئەم سیستمە لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهـەمدا لەئـەنجامی ئەزموونـەوە ســەری هـــەڵداو بەسیســـتمی ئەنگلوسەکســۆنی ناســـراوە، لەســـاڵی 1878دا ویلایەتی ماساشۆستس پیادەی کـردو دواتـر بەهـەموو ولایەتـەکانی تریشـدا بڵاوبۆوە، بەڵام لەبەریتانیا ئەم سیسـتمە وەك نـەریتێکی قـەزائی لەسـەدەی نــۆزدەوە هاتۆتــە بــوون ولەســاڵی 1907دا پیــادە کــراوە بــە نــاوی (یاســای تاقیکردنەوەی بەریتانی بۆ گوناهباران) ولەساڵی 1948دا خرایە سـەر یاسای قەزائی تاوان(100).**

زۆربەی یاسای ولأتانی ئەوروپا ئەم سیستمەیان وەرگرت وپیادەیان کرد لەپێشیانەوە ولأتانی بەلجیکاو ئەڵمانیاو فەرەنساو هوڵندە، ئەمڕۆ لەزۆربەی ولأتانی دنیادا کاری پێدەکرێت وشوێنێکی تایبەتی هەیە لەنێو سیاسەتی تاواندا وەك چارەسەرێکی گونجاو وشیاو بۆ ڕاهێنانەوەی تۆمەتبار یان حوکمدراو بێئەوەی پێویستی بەوە بکات لەخێزان وکۆمەڵگا دور بخرێتەوە وبخزێنرێتە زیندانەوە.

## بەراورد کردن لەنێوان (تاقیکردنەوەو هەڵپەساردنی سزا) دا:

گەرچی لەنێوان هەردوکیاندا لێکچون هەیەو، لەهەردوو حاڵەتەکەدا سزاکە بۆماوەیەکی دیاری کراو ڕادەگیرێت و، حوکمدراو دەخرێتە ژێر ئەزموونەوەو بەکۆتایی هاتنی ئەو ماوە دیاری کراوە حوکمەکە یان هەڵپەساردنی سزاکە هەڵدەوەشێنرێتەوە، بەلأم لەسێ خاڵدا جیاوازی لەنێوانیاندا بەدی دەکرێت کەبریتین لە:

1- لەسیستمی (هەڵپەساردنی سزادا) بڕیار دەدرێت بەتاوانبارکردنی تومەتبار وسەپاندنی سزای تاوان، بەلأم لە (تاقیکردنەوە) دا ئەشێت بەرلەدەرکردنی بریاری تاوانبارکردن پراکتیزە بکرێت، یان لەدوای دەرکردنی بڕیاری تاوانبارکردن وسزاوە پراکتیزە بکرێت.

2- لەسیستمی (هەڵپەساردنی سزادا) پێویست ناکات ئازادی حوکمدراو زەوت بکرێت بەڵکو وازی لێدەهێنرێت خۆی خودی خۆی چاك بکات، بەلأم لەسیستمی (تاقیکردنەوەدا) تومەتبار ئازادیەکەی کۆت وبەند دەکرێت وهەندێك وابەستە بوونی بەسەردا دەسەپێنرێت و، کەسێکیش ڕادەسپێردرێت چاودێریو سەرپەرشتی بکات ویارمەتی بدات(101)، 102).

3- هەڵوەشـاندنەوەی (رأگرتنـی جێبـەجێكردنی سـزا) بـەندە بـەوەوە كـەحوكمدراو لـەوماوە دیـاری كـراوەدا تـاوانێكی نـوێ ئـەنجام بـدات، بـەلاًم لەتاقیكردنـەوەدا هەڵوەشـاندنەوەی بڕیارەكـە پـەیوەندی نییـە بـەكردنی تـاوانی نـوێوە، ئـەوەندە بەسـە كەتۆمـەتبار سـەرپێچی بكـات لـەو وابەسـتەبوونانەی خراونەتـە ئەسـتۆیەوە یـاخود بـەد ڕەفتاریـەك ئەنجام بدات.

## وێنەكانی تاقیكردنەوە:-

لەهەموو قۆناغەكانی داوانامەدا (الدعـوى) ئەشێت ئـەم سیستمە پیـادە بكرێت، یان لەدوای دەركردنی حوكم وجێبەجێكردنیـەوە بێت (لـەقۆناغی تاوانبـاركردندا) یـان لـەقۆناغی دادگـاییكردندا، بەشـێوەیەكی گشـتی دوو وێنـەی بـاوی تاقیكردنـەوە هەیـە كـەبریتین لـە: تاقیكردنـەوە لـەپێش تاوانباركردندا و، تاقیكردنەوە لەپاش تاوانباركردن.

یەكەم: تاقیكردنەوە لەپێش تاوانباركردندا:-

دیـارترین شـێوەی تاقیكردنـەوە ئەوەیـە كەلـەقۆناغی دادگـاییكردندا پراكتیزە دەكرێت، دوای ئەوەی كەتاوانەكە بەسـەر كەسـی تۆمـەتباردا سـاغ دەبێتەوەو ئەچەسپێت، بـەر لـەوەی حوكمـی تاوانبـاركردنی دەربچێت. لـەم حاڵەتەدا ئەگەر دادگا بارو زروف وكەسێتی تۆمەتباری ڕەچاوكردو، گومـانی نـەما لـەوەی كەتاوانەكـەی ئـەنجام داوەو، ئەگـەر گەیشـتە ئـەو بڕوایـەی كەپێویست ناكـات ئـەم كەسـە بخرێتـە نێـو زیندانـەوە لـەم حاڵەتـەدا دادگـا فەرمان دەدات كەبخرێتە ژێر تاقیكردنەوەوە(103)، (104).

دووەم: تاقیکردنەوە لەدوای تاوانبار کردنەوە:-

لەم شێوەیەدا تاقیکردنەوە لەدوای دەرکردنی حوکمی تاوانبارکردن وسزادانەوە پراکتیزە دەکرێت، واتا بەندە بەفەرمانی دادگاوە کەجێبەجێکردنی سزاکە رابگرێت وتاوانبار بخرێتە ژێر تاقیکردنەوەوە. ئەم سیستەمەش پێی دەوترێت ((هەڵپەساردنی سزاو تاقیکردنەوە)) ئەم سیستمە لەئەڵمانیاو فەرەنساو پۆڵۆنیا، باوەو پەیرەو دەکرێت(105)، (106).

## مەرجەکانی تاقیکردنەوە:-

1- مەرجەکانی تایبەت بەتۆمەتبارەوە:-

سیستمی تاقیکردنەوە تەنها بەسەر دەستەو گروپێك لەتۆمەتبارو حوکمدراودا پراکتیزە دەکرێت، بەو مەبەستەی سەرلەنوێ بۆناو کۆمەڵگا بگەرێنەوە بەپشت بەستن بە بەرنامەو پرۆگرامێکی پۆزەتیف ویاریدەدەر، لێرەدا تاقیکردنەوە پێویستی بەوەیە پشکنین بۆ تۆمەتبار بکرێت ولەکەسێتی و زروف وژینگەکەی بکۆڵرێتەوە، بۆ دڵنیا بوون لەوەی مامەڵە کردن لەگەڵ تاوانباردا لەدەرەوە باشترە نەك لەناو زینداندا. لەیاسای هەندێ وولاتدا وەك فەرەنسا سیستمی تاقیکردنەوە لەگەڵ تاوانباری سیاسی وئەوکەسانەدا بەکارنایەت کەپێشتر خراونەتە ژێر تاقیکردنەوەو شکستیان لەو ئەزموونەدا هێناوە.

یاسای هەندێ ولاتیش وەك ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم سیستمەی بەستۆتەوە بەرەزامەندی تۆمەتبارەوە، واتا دەبێت ئەویش پێی رازی بێت، ئەمەش لەبەر ئەو هۆیەی کەراهێنانەوە بەندە بەئیرادەی کەسەکەوە و دەبێت هاوکاری یاریدەدەرەکانی بکات وقبوڵیان بکات و

ئارەزوویەکی بێگەردی هەبێت بۆ وابەستە بوون بەو شتانەوە کەلەماوەی تاقیکردنەوەدا دەسەپێنرێت بەسەریدا.

2- مەرجەکانی تایبەت بەتاوانەوە:-

لەزانستی سزاداندا سیستمی تاقیکردنەوە بەهیچ مەرجێکەوە نابەسترێتەوە کەتایبەت بێت بەتاوانەوە بۆئەوەی دادوەر بواری ئەوەی بدرێتێ کەگرنگی بەکەسێتی تاوانبار بدات و، بایەخی ئەم سیستمەش لەبەر چاو بگرێت بەبێ ئەوەی ڕادەو قەبارەی تاوانەکە لێکبداتەوە. بەلام هەندێ یاسا تاوانە گەورەو قورسەکان دوردەخەنەوە لەو تاوانانەی کەسیستمی تاقیکردنەوە دەیانگرێتەوە. یاسای ئینگلیزی وئەمریکی ئەو تاوانانە دور دەخەنەوە کەسزاکەیان لەسێدارەدان یاخود بەندکردنی هەمیشەیی‌یە ، بەلام یاسای فەرەنسی ئەو تاوانانە دوور دەخەنەوە کەسزاکەیان لەپێنج ساڵ وزیاترە(107).

لەماوەی تاقیکردنەوەدا چەندین وابەستەبوون دەسەپێنرێت بەسەر ئەو کەسانەدا کەخراونەتە ژێر تاقیکردنەوە بەگشتی لەدووپۆلدا کۆدەبنەوە:

## وابەستە بوونە پۆزەتیفەکان:

چەند جۆرێکن وەك: بەزۆر نیشتەجێکردن لە شوێنێکی دیاری کراودا و، بەدوادا چوونی بەرنامەی تایبەت بەفێرکردن وپاکژکردنەوەو بەسەربردنی کاتی بێئیشی‌یەوە، هەروەها مەشقی پیشەیی یان ئیش پێکردن لە سەرپیشەیەکی دیاری کراو، خستنە ژێر پشکنینی پزیشکی وجەستەیی وعەقڵی‌و دەروونی، یان چارەسەر کردن لەنەخۆشخانەدا (بەتایبەتی بۆ ئالوودەبوانی کحول ومادە سڕکەرەکان). وهاوبەشی کردن لەخەرجی خێزان وقەرەبووکردنەوەی زیانەکانی تاوان.

**وابەستە بوونە نێگەتیفەکان**:

وەك: قەدەغەکردنی لێخوڕینی هەندێ ئۆتۆمبێل و، ڕێگرتن لەچوون بۆ قومارخانە ومەیخانە وبەدخانە وشوێنی پێشبڕکێ، ڕێگرتن لـە بـەکارهێنانی مــادە ســڕکەرەکان، یـــان زیـــاد ڕەوی لەخواردنـــەوەی مـــەی، ڕێگرتـــن لەتێکەڵبوونی تاوانبـار یـان کەسـانی گومــانلێکراو، یــان میوانــداری کــردن لەهەندێ کەسی گومانلێکراو لەناو ماڵدا. لەهـەموو حاڵەتـەکاندا دادگـا بـۆی هەیە ئەم وابەستە بوونانە بسەپێنێت (ئەگەر بەپێویستی بزانێـت) بەسـەر کەسێکدا کەدەخرێتە ژێـر تاقیکردنـەوەوە وەهـەروەها بـۆی هەیـە لـەماوەی تاقیکردنەوەکەدا گۆڕانکاریان بەسەردا بهێنێت وڕاستیان بکاتەوە(108).

## پارۆڵ Parol

پارۆل لەبناغەدا ووشەیەکی فەرەنسی‌یە و، بەشێوەی خواستن لەجیّی ووشەی ئابڕوو (الشرف) بەکاردەهێنرێت. بیرۆکەی پارۆل دەگەڕێتەوە بۆ زانای ئینگلیزی سزادان (الکسندر ماکونۆچی) وبۆیەکەم جار لەسی‌یەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بانگەشەی بۆکردووەو، لەساڵی 1840لەدورگەی (نورفۆلك) ی‌ئوستڕالیا پیادەی کردووە. وەك یاساش ویلایەتی ماساشوستس یەکەمین یاسای تایبەت بەپارۆڵی لەساڵی 1837دا دەرکردووە وپاشان بەشێوەی پلەپلە هەموو ویلایەتەکانی‌تر هەمان یاسایان دەرکردووەو پیادەیان کردووە. ئەمرۆ لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بەشێوەیەکی بەرفراوان جیّبەجیّ دەکریت وسەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوەو زاناکانی سزادانیش پشتگیری لیّدەکەن(109).

**پێناسەی پارۆڵ**: یان (ئازاد کردن بەگفتی ئابڕوو یان شەرەف) شێوازێکی مامەڵەکردنی سزایی‌یە، لەم شێوازەدا بەندکراو لەدوای تەواوکردنی بەشێك لەسزاکەی کەزەوت کردنی ئازادی‌یە، ئازاد دەکرێت و بەڵێن دەدات لەدوای بەربوونی لەزیندان مل کەچ بێت بۆ سەرپەرشتی کردنی کۆمەڵایەتی‌و پارێزگاری کردنی ڕەفتاری باش وپۆزەتیف و، نابێت سەرپێچی لەو بەڵێننامەیە بکات هەتا ماوەی سزاکەی کۆتایی پێدێت(110).

ئەم سیستمە پشت بەبیرۆکەیەك دەبەستێت کەبریتی‌یە لە: دەستکردن بەڕاهێنانەوەی بەندکراو لەناو دامەزراوە سزایی‌یەکەدا تائەو کاتەی

دەردەكەوێت (واتا پاش تەواوكردنی بەشێك لەسزاكەی) پێویست بەوە ناكات كە ماوەی درێژتر لە زینداندا بمێنێتەوە، دەسەڵاتی تایبەتمەندو پەیوەندار بۆیان هەیە ئازادی بكەن بۆ ئەوەی بەجۆرێكی تر ولەنێو كۆمەڵگادا مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت(111).

## بەراورد كردنی پارۆل لەگەڵ تاقیكردنەوەدا:

ئەم دووسیستمە لەدوو ڕووەوە لەیەك دەچن كەبریتین لە:

1- هەردوكیان یەك شێوازی ڕاهێنانەوەن وپشت بەچاودێری كۆمەڵایەتی وڕاهێنان لەسەر ژیانی شەرەفمەندانە دەبەستن. لەهەردوو حاڵەتەكەدا سەرپەرشتیاران هەمان پسپۆری وئەركیان هەیە یاخود زۆر لەیەكتریەوە نزیكن.

2- لەجەوهەری سزاییدا یەكدەگرنەوە، چونكە لەهەردوكیاندا ئازادی كەسی حوكمدراو كۆت وبەند دەكرێت ومل كەچ دەكرێت بەسەرپەرشتی شەخسیو، پەیمان دەدات وابەستەبێ بەو بڕیارەوە كەدەسەڵاتی پەیوەندیدار دەریكردووە بۆی.

<u>بەلام سیستمی بارۆڵ بەم چەند خاڵەدا لەسیستمی تاقیكردنەوە جیادەكرێتەوە:</u>

أ-لەسیستمی بارۆڵدا دەبێت حوكمدراو بەشێك لەسزاكەی لەنێو دامەزراوی سزاییدا جێبەجێبكات، بەلام لەسیستمی تاقیكردنەوەدا تۆمەتبار ناخرێتە هیچ دەزگایەكی سزادانەوەو، تێكڕای بەرنامەكانی ڕاهێنانەوە لەنێو كۆمەڵگادا پراكتیزە دەكات.

ب- ئەو كەس و گروپانەی سیستمی پارۆڵیان بەسەردا جێبەجێ دەكرێت جیاوازن لەوانەی سیستمی تاقیكردنەوەیان بەسەردا جێبەجێ

دەکرێت، لەپاڕۆڵدا دەسەلاَتی قەزائی بەپێویستی دەزانێت ئازادی ئەو کەسانە زەوت بکرێت، پاشان ئەوەش دەسەلمێنرێت کەسودیان لەو مامەڵەیەی نێو زیندان وەرگرتووە، دواتر ئەو زەرورەتە نامێنێت کەلەزینداندا بمێننەوە بۆیە وابەباش دەزانرێت ئازاد بکرێت ولەنێو کۆمەڵدا چاودێری ڕاهێنانەوەیان بکرێت(112). بەلاَم سیستمی تاقیکردنەوە بەسەر ئەو کەسانەدا پراکتیزە دەکرێت کە دەسەلاَتی قەزائی پێی باشە ئازادییان لێزەوت نەکرێت وهەرلەسەرەتاوە لەنێو کۆمەلگادا دەست بەڕاهێنانەوەیان بکرێت.

ج- پاڕۆڵ پەیوەستە بەبەردەوام بوونی جێبەجێکردنی سزاوە بەلاَم تاقیکردنەوە پەیوەستە بە خودی بنەمای جێبەجێ کردنی سزاوە، کەواتە دەکرێت بوترێت: کاردانەوەیی سزایی بۆتاوان لەپاڕۆڵدا زاڵە بەسەر کاردانەوەی چاککردن وچاکسازیدا، بەلاَم لەتاقیکردنەوەدا کاردانەوەی چاککردن وچارەسەری تاوان زاڵە بەسەر کاردانەوەی سزاییدا (واتە پاڕۆڵ زیاتر سزایە بەلاَم تاقیکردنەوە زیاتر چاککردنە)

د- پاڕۆڵ سیستمێکی کارگێڕییە، واتا لەدەسەلاَتی ئەو کارگێڕییەدا کەسزاکە جێبەجێدەکات، بەلاَم تاقیکردنەوە سیستمێکی قەزائییە وتایبەتە بەدەسەلاَتی قەزائییەوە، بۆیە نانراوە تاقیکردنەوەی قەزائی(113).

## شوێنەوارەکانی پاڕۆڵ:

ئەگەر هاتوو ئەو کەسەی مل کەچی سیستمی پاڕۆڵە سەرپێچیکرد لەو مەرجانەی بەسەریدا سەپێنراوە، ئەوا سەر لەنوێ دەگەڕێنرێتەوە بۆ زیندان، ئەمەش لەکاتێکدا دەکرێت کەسەرپەرشتیارە کۆمەلاَیەتییەکەی

ئاگــاداری دەســتەی پــارۆلْ بکاتــەوە لــەو ســەرپێچیەی کــەحوکمدراو کردوویەتی، ئەوکاتە فەرمانی گرتن وگێڕانەوەی بۆزیندان دەردەکریت ئەم بڕیارەش دوا بڕیارەو هەڵناوەشێتەوە(114).

ڕەنگە کەسەکە بخرێتــەوە زینــدان بــەبێ ئــەوەی ســەرپێچی مەرجــەکانی پارۆڵیشی کردبێت ئەمەش لەم حاڵەتانەدا: ئەگەر حوکمدراوەکە خۆی حەز بکات بگەڕێتەوە نێو زیندان بەو بیــانووەی کــەناتوانێت ئیشێك بدۆزێتــەوە لەدەرەوەی زینــدان، یــان حــەزبکات پرۆگرامــی ڕاهێنانــەوەی پیشــەیی لــەنێو زینداندا تەواو بکات، یاخود سەرپەرشــتیارە کۆمەلآیەتیەکــەی بەپێویســتی بزانێت بۆمەشق کردنی زیاتر یان چاودێری پزیشکی جارێکیتر بخرێتــەوە زینــدان. خۆئەگــەر حوکمدراوەکــە لــەماوەی ســزادانەکەیدا هیــچ جــۆرە سەرپێچیەك لە سیستمی پارۆلْ نەکات ئەوا سزاکەی هەڵدەوەشێتەوە، ئــەو ماوەیەش کەحوکمدراو دەبێت مل کەچی سیستمی پــارۆلْ بێت مــەرج نییــە لەهەموو ولآتێکدا تاکۆتایی مــاوەی ســزادانەکەی درێــژە بکێشێت، بۆنموونــە لەهــەندێ ویلایــەتی ئەمــەریکادا دەســتەی پــارۆلْ مــافی دیــاری کردنــی ئەوماوەیــەیان هەیــە بەمــەرجێك ئــەو ماوەیــە زیــاتر نــەبێت لــەماوەی ئــەو سزایەی کەبەسەریدا سەپێنراوە(115).

## ئازادكردنی مەرجدار (الافراج الشرطي)

ئـازادكردنی مـەرجدار یەكێكـە لەشـێوازەكانی مامەڵـەكردنی سـزایی، بەپێی ئەم شێوازە حوكمدراوەكە ئازاد ئەكرێت بەر لەوەی ماوەی سزاكەی لەزینداندا تەواو بكات، بەمەرجێك لەوماوەیەدا كەماویەتی مل كەچ بێت بۆئەو وابەستە بوونانەی دەخرێنە ئەستۆیەوە(116)، لە حاڵەتێكدا ئەگەر سەرپێچی بكات جارێكی تر دەگەڕێنرێتەوە بۆ نێو دامەزراوە سزاییەكە، مێژووی ئەم شێوازە مامەڵە سزاییە دەگەڕێتەوە بۆساڵی 1790و لەوڵاتی فەرەنسا كاتێك میرابۆ (Mirabeau) ڕاپۆرتێكی بۆ كۆمەڵەی نیشتمانی بەرزكردەوەو تیایدا داوای كردبوو ئەم سیستمە بخرێتە نێو یاسا سزاییەكانی فەرەنساوە، وەك كەرەسەیەك بۆ چاككردنی سیستمی بەندیخانەكان وساڵی 1874 دادوەری بەناوبانگی فەرەنسی بۆنفیل دو مارساینی (Bonneville de Marsangy) دەستی دایە بانگەشەكردن بۆئەم سیستمەو بەهەموو شێوەیەك تێدەكۆشا بۆداڕشتنی یاسایەك لەم بارەیەوە، ئەم هەوڵەی مارساینی بەردەوام بوو هەتا ئەوكاتەی كۆمەڵەی نیشتمانی لە 1885/2/14 بەشێوەیەكی یاسایی سیستمی ئازادكردنی مەرجداری قبوڵ كردو تێكەڵ بەیاسا سزاییەكانی فەرەنسای كرد(117).

لەئازادكردنی مەرجداردا، سزادان كۆتایی پێنایەت بەڵكو شێوازی جێبەجێكردنی سزاكە ڕاست دەكرێتەوەو وێنەیەكی تری زەوت كردنی ئازادی بەخۆوە دەگرێت، ئەم ڕاستكردنەوەیەش پەیوەستە بەئامانجەكانی ڕاهێنانەوەی كۆمەڵایەتییەوە، چونكە حوكمدراو ئەگەر بەشێكی گەورەی سزاكەی لەنێو دامەزراوە سزاییەكە بەسەربەرێت ئەوا مەرامەكانی

ڕاهێنانــەوە بەیــەکجاری لەبــەین دەچێــت بۆیــە باشــتر وایــە ئــازادبکرێت وبگەڕێنرێتەوە نێو کۆمەڵگا بـۆ بـەدواداچوون وچـاودێری کردنـی پرۆسـەی ڕاهێنانەوەکەی(118).

هــەروەك ئاماژەمــان بۆکــرد ئــەم سیســتمە ســـزایە لەبنچینـــەدا فەرەنسـی‌یەو وەك پاداشـتێك لـەبری چـاکبوونی ڕەفتـاری حوکمـدراو لـەنێو بەندیخانـەدا، پێشکەشـی دەکرێـت، پاشـان وردە وردە گـۆڕرا بـۆ سیسـتمی ڕاهێنانــەوە. لەلایەکــەوە حوکمدراوەکــە هــاندەدات بــۆ پــەیڕەوکردنی بەرنامەیەك تاڕەفتارەکانی لـە نێـو بەندیخانـەدا ڕاسـت بکاتـەوەو پەیوەسـت بێـت بەیاسـاو سیسـتمەوەو ڕەوشـێکی وا بخولقێنێـت تـاکو بەرنامــەکانی ڕاهێنانــەوەی بــەجۆرێکی مـاقول بەســەردا جێبــەجێ بکرێـت. لەلایــەکی تریشەوە ئەو دەرفەتەی بۆدەڕەخسێت لـەدەرەوەی دامـەزراوە سـزایی‌یەکەدا، چـاودێری‌و بــەدوادا چوونــی ڕاهێنانەوەکــەی بۆبکرێــت ولەگــەڵ کۆمــەڵگا ڕابێتەوە ورێگاش خۆش بکات بۆئەوەی بەیەکجاری ئازادبکرێت(119).

## بەراورد کردنی ئازادکردنی مەرجدار بەسیستمی پارۆڵ:

ئەگــەر بگەڕێینــەوە بــۆ پێناســەی ئــازادکردنی مــەرجدار دەبینـــین لەسیسـتمی پارۆڵەوە زۆرنزیکە و، ئـەتوانین بڵێین لــەدووخاڵی سـەرەکیدا وەکویەك وان:-

1- لەهـەردوو سیسـتمەکەدا، بەندکراوەکـە لـەدوای تـەواوکردنی بەشـێك لەسزاکەی لەنێو دامەزراوە سزایی‌یەکاندا، ئازاد دەکرێت.

2- ئەو کەسانەی مل کەچی پارۆڵ وئازادکردنی مەرجدار دەبن وسودیان لێ وەردەگرن، دەبێت بخرێنە ژێر چاودێری کردنـەوەو یارمـەتی بدرێـن یـان

هەندێك وابەستەبوون بخرێتە ئەستۆیانەوە و، ئەگەر سەرپێچی بکەن ئـەوا سەرلەنوێ دەگەڕێنرێنەوە بۆ نێو دامەزراوە سزاییەکان(120).

بـەلاَم ئـازادکردنی مــەرجدار لەوێنــە ڕۆتینیەکـەیدا، لـەم دوو خالَـەدا جیاوازە لە پارۆلْ:-

یەکەم: پێوەری ئازادکردنی مەرجدار بریتییـە لـەچاك بوونـی ڕەفتـاری بەندکراوەکـە لـەنێو بەندیخانـەدا، بـەلاَم پێـوەری پـارۆلْ بریتییـە لــەڕادەی پێداویستی بەندکراوەکە (بـەپێی کەســێتی وباروزروفەکـەی) بەمانــەوەی لەبەندیخانەدا یـاخود بـەچاودێری کردنـی پڕۆسـەی ڕاهێنانـەوە لـەدەرەوەی بەندیخانە.

دووەم: سیســتمی ئــازادکردنی مــەرجدار ڕۆڵــی نێگــەتیف دەگــێڕێت لەمامەڵـەکردنی ســزاییدا چونکـە واز لەحوکمدراوەکـە دەهێـنرێت خــۆی خـودی خـۆی چـاك بکـات وبڕێك وابەسـتە بوونـیش دەخرێتـە ئەسـتۆیەوە، بـەلاَم پـارۆلْ ڕۆڵـی پۆزەتیـف دەگێڕێت چونکـە سەرپەرشــتیاری (کەســێکی پسپۆڕ) بۆ دەستنیشان دەکرێـت بۆئـەوەی یارمـەتی بـدات لەگـەلْ کۆمـەلگادا خۆی بگونجێنێت(121).

بــەکورتی: سیســتمی ئــازادکردنی مــەرجدار بەچەمکــە ڕۆتینیەکــەی جیــاوازە لــەپارۆلْ، بــەلاَم بەچەمکــە نوێیەکــەی (واتــا دوای ئــەوەی بــوو بەسیســتمی ڕاهێنانــەوە) زۆرجیــاوازی نییــە لــەپارۆلْ تەنــها لەهــەندێ وردەکـاری تیـوری وپراکتیکیـدا نــەبێت و، ئــەوەندەش هەیــە سیســتمی ئــازادکردنی مــەرجدار پــەیوەندی بەیاســای ســزاکانی فەرەنســاوە هەیــە وپەیوەسـتە پێـوەی، بـەلاَم پـارۆلْ پەیوەسـتە بـە سیسـتمی یاسـاکانی ولاَتــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە.

### كۆڵەكە بنچینەییەكانی سیستمی ئازادكردنی مەرجدار:

ئەم سیستمە لەسێهەنگاوی سەرەكی ڕێكخراو پێك دێت كەیەك لەدوای یەك ڕیزبەندی كراوەو لەیەكتر جیانابنەوەو بریتین لە:

- ئامادەكردن.
- هەڵبژاردن.
- سەرپەرشتی كردن (لەدوای ئازاد كردنەوە)(122).

ئامادەكردن:

هەر حوكمدراوێك لەڕێی ئازادكردنی مەرجدارەوە بەر ببێت پێویستە ئەو ماوەیەی كەلەناو دامەزراوە سزاییەكەدایە بەشێوەیەكی ڕاست ودروست ئامادە بكرێت، ئامادەكردنیش دەبێت پشت بەسیستمێك ببەستێت ونەخشەو پلانی بۆ كێشرابێت بەمەبەستی چارەسەركرن وچاككردنەوەی زیندانییەكە لەلایەن دەستەیەك كارمەندی تەكنیكی لێپرسراوەوە. ئەگەر بەم جۆرە بەڕێوە نەچێت ئەوكاتە ناتوانین بڵێین ئازادكردنی مەرجدار سیستمەو كاریگەری هەیە لەپرۆسەی ڕاهێنانەوەو چاككردنی زیندانییەكان وگەڕانەوەیان بۆژیانی گشتی سەربەست لەنێو كۆمەڵگادا.

هەڵبژاردن:

ئەو ماوەیەی كەپێویستە زیندانییەكە لەنێو دامەزراوە سزاییەكەدا بەسەری بەرێت بایەخێكی مەزنی هەیە لەشكست پێهێنانی پرۆسەی چاككردندا. بۆیە لەكاتی هەڵبژاردنی ئەو زیندانییانەی كەئەم سیستمە دەیانگرێتەوە پێویستە پشت بەشیكاری وردی سەرجەم ڕاپۆرتەكان ببەسترێت كەتایبەتن بەزیندانییەكەوە پێش ئەوەی بێتە زیندانەوە

ولەوكاتانەشـدا كەپرۆسـەی چـاككردنی بەسـەردا جێبـەجێكراوە لـەنێو دامەزراوە سزاییەكە ڕاپۆرتەكانیش بریتین لە:-

- ڕاپۆرتـی كۆمەڵایـەتی، ئـەم ڕاپۆرتـە لەلایـەن دادگـای پەیوەندیدارەوە ئامادەدەكرێت.

- ڕاپۆرتی دەستی پۆلێن كردن.

- ڕاپۆرتـی بەجێهێنـەرانی پرۆگرامـی چـاككردن بەشـێوەیەكی گشتی.

- ڕاپۆرتـی ئـەو كارمـەندەی بەپرۆسـەی چاككردنەكـە هەڵسـاوە، هەروەها ڕاپۆرتی ئەو زیندانیانەش كەبەبـەردەوامی لەگەڵ زیندانییەكـەدا ژیاون.

- ڕاپۆرتـی كارمـەندی ڕاژەی كۆمەڵایـەتی كەلـەدوای ئـازادكردنی بەندكراوەوە دەبێتە سەرپەرشتیاریو چاودێری دەكات.

لـێرەدا چـەند هۆكـارێكی پۆزەتیـف هەیـە كەبەشـداری دەكـەن لەئازادكردنی بەندكراوەكەدا وەك:-

- گوێڕایـەڵی وسـەرپێچی نـەكردنی كارمـەندی چـاككردن وسەرپەرشتیارە كۆمەڵایەتییەكان.

- دەركـەوتنی گۆڕانكـاری لـە هەڵوێسـتەكانی بەندكراوەكـەدا بەرامبەر بەئیش كردن وچەمكی تاوان.

- گۆڕانكاری لەدیدو بۆچوونی بەندكراوەكـەدا سـەبارەت بەیاسـاو وەڵامدانەوەی بۆ ئەوكردەوانەی كەیاسا حەرامی كردووەن.

بەڵام ئەو هۆكارە نێگەتیفانەی كەدەبنە لەمپـەڕ لەبـەردەمی ئـازادكرنی حوكمدراوەكەدا ئەمانەن:

- بوونی هەست وبیركردنەوەی شەڕانگێزی.

- باری كۆمەڵایەتیو خێزانی ناجێگیر.
- پچڕانی پەیوەندی یان نەمانی پەیوەندی بەخێزانەوە.
- ئـەوە دەربكـەوێت كەبەندكراوەكـــە كــاری دەســت ناكــەوێت لەدەرەوەی زینداندا.
- بسەلمێنرێت كەئالودەیە بەمەی ومادە سڕكەرەكانەوە(123).

## مەرجەكانی ئازادكردنی مەرجدار:

- سـەبارەت بەگەورەكان لـەچوار بەشی مـاوەی زیندانــی كردنەكـە بەشـێكی بـەر ئـەم سیستمە دەكـەوێت، بـەلاّم بـۆ مـێردمندالّ (نەوجــەوان) لەسێبەش، یەك بەشی بەر ئەم سیستمە دەكەویت.
- ئەگەر دادگا دڵنیابوو لەباش بوونی ڕەفتارەكانی كەسی حوكمـدراو بەپشت بەستن بەڕاپۆرتی لیژنەی پەیوەندیدار لە كارگێڕی دامەزراوەكەدا.
- پێویسـتە ئـەو ماوەیـەی كەبـەندكراو لـەزینداندا بەســەری دەبـات كـەمتر نـەبێت لەشــەش مـانگ. بـەلاّم ئەگــەر چــەند ســزایەكی (یــەك لەدوایەك) بەسەردا درابـوو لەوحاڵەتـەدا ماوەكە لەسـەر بناغـەی تێكـڕای سزاكان هەژمار دەكرێت وئەوماوەیەش كەلـەدەزگاكانی گرتـن وگواسـتنەوەو (توقیف وتسفیر) دا بەسەری بردووە بەهەمان شێوە دێتە هەژمار كردن.
- ئەگـەر بەشـێك لەسـزاكەی بـەر لێبووردنـــی گشـتی یــان تایبــەتی بكـەوێت، لـەم حاڵەتـەدا، لەوبەشــەی كەماوەتــەوە بــەندی یەكـەمی ئــەم مەرجانە حساب دەكرێت(124).

## سودەكانی ئازادكردنی مەرجدار:

يەكەم: سەبارەت بەكۆمەڵگا:

1- دەســەڵاتی دەزگــای چــاككردن بــۆی هەيـــە پـــەيوەندی ڕاســـتەوخۆ بەزيندانیيەكـەوە بكـات، دواتريـش چاكیبكـات وئاراسـتەو ڕێنمـايی بكـات بەتايبـەتی ئـەو كەسـانەی خۆيـان بـۆ ئـازادكردنی مـــەرجدار ئامـادەكردووە ئەمـــەش وايـــان لێدەكـــات پرۆگرامـــەكانی چـــاككردن قبـــوڵ بكـــەن و زياترگوێڕايەڵ بن.

2- ئەوكەســەی بەشــێوەيەكی مــەرجدار ئــازاد دەكرێــت وبۆماوەيـــەك سەرپەرشتی دەكرێت، ئەمە دەبێتە هۆی پاراستنی كۆمەڵگا لـەڕوودانی هـەر تــاوانێكی نــوێ لــەكاتێكدا كەســـەكە بەوپـــەڕی ئازادیيـــەوە دەگەڕێتـــەوە كۆمەڵگاو هيچ كۆت وبەندێكی لەسەرنیيە.

3- جياوازی نێوان ئازادكردنی مەرجدارو ئازادكردنی بێمەرج ماوەيەكی زەمەنیيـەو تيـايدا بـوار دەڕەخسێ تـاكو كەســەكە بـير لـەژيانی سروشـتی بكاتەوە.

4-كـەڵك وەرگرتـن لــەو كەسـانەی ســووديان لـە سيسـتمی ئـازادكردنی مــەرجدار وەرگرتــووە وەك هــێزی كـار بــۆ خزمــەتی ئـابوری نيشـــتمانی بەتايبەتی لەو وڵاتانەدا كە پێويستيان بەهێزی كار هەيە.

5- ئەم سيستمە ئاسانكاری بۆ دەسەڵاتی پەيوەنددار دەكات بۆ سەرلەنوێ گێڕانـــەوەی كەســـەكە بۆبەشـــی چـــاككردن لـــەكاتێكدا بەڵگـــەی خراپـــی ڕەفتاركردن لەكەســەكەدا دەردەكـەوێت بـەبێ ئـەوەی چاوەڕێ بكرێـت تـاكو تاوانی نوێ ئەنجام بدات.

6- سیستمی ئازادکردنی مەرجدار وەك پردێك وایە كـەژیانی ناسروشـتی ناو زیندان بەژیانی سروشتی كۆمەڵگاوە دەبەستێتەوە چونكـە لەوماوەیـەدا كەسـەكە دەبێـت ڕەفتارەكـانی بـاش بكـات و بـەردەوامی وەربگرێـت لـەو ڕەفتاركردنـەدا وبیكـات بەنـەریت بـۆ ئـەو زەمەنـەی دەكەوێتـە دوای ئازادكركدنی بێ مەرجەوە.

سەبارەت بەكارگێڕی بەشی چاككردن:

گەرچی پراكتیزە كردنی ئـازادكردنی مـەرجدار ئـەركێكی قورسـەو كـات ومـاندووبوونی زۆری دەوێـت بۆئاراسـتەكردن وچـاودێری وڕێكخسـتنی ڕاپۆرتـەكان... تـاد، بـەلاّم لەهـەمان كـاتدا سـوودێكی زۆر بەدامـەزراوی چاككردن دەگەیەنێت وەك:

- ئـەم سیسـتمە هـانی بـەندكراوەكان دەدات زیـاتر گوێڕایـەڵ و وابەسـتەبن بەیاسـاكانی نـاو زینـدان و دوربكەونـەوە لەسـەرپێچی كـردن چونكە زیانیان لێدەدات و پرۆسەی ئازادكردنیان دور دەخاتەوە.

- ئـەم سیستمە ئەبێتـە هـۆی كەمكردنـەوەی قـەرەباڵغی لـەنێو دامەزراوە سزاییەكاندا.

- ئەم سیستمە یارمـەتیدەرە بـۆ كـەم كردنـەوەی خـەرجی لـەنێو دامەزراوە سزاییەكاندا.

- پاڵ بـەكارگێڕی بەشـەكانی چاككردنـەوە دەنێت بۆبایـەخ دانـی زیاتر بەپرۆسەی پۆلێن كردنی بەندكراو وجیاكردنەویان(125).

**لەم حاڵەتانەدا دادگای پەیوەندیدار چاوەخشێنێتەوە بەسەر بڕیاڕی ئازادکردنی مەرجداردا:-**

- ئەگەر ئازادکراوەکە سەرپێچی کرد لەمەرجەکانی ئازادکردنی مەرجدار ئەوا دادگا ئەم ڕێگایانە دەگرێتە بەر:

أ- بانگهێشت کردن وئاگادارکردنەوە.

ب- هەربڕیارێك کەگونجاو بێت بەلای دادگاوە، دەردەکرێت.

ج- هەڵوەشانەوەی بڕیاری ئازادکردنی مەرجدار.

2- ئەگەر دادگا داوانامەی ئازادکردنی مەرجدار ڕەفز بکات ئەوا: لەدوای بڕیاری ڕەفز کردنەوە، هەتا سێمانگ داوا نامەی لەو جۆرە نابێت بۆ دادگا لەلایەن هەمان کەسەوە بەرز بکرێتەوە.

3-دادگا بڕیاری ئازادکردنی مەرجدار هەڵدەوەشێنێتەوە ئەگەر هاتوو کەسە ئازادکراوەکە لەلایەن دادگاوە سزا بدرێت وسزاکەش زەوت کردنی ئازادی بێت بەمەرجێك لەسی (30) ڕۆژ کەمتر نەبێت لەو کاتەدا کەلەژێر ئەزموونی مەرجداردایە.

4- ئەگەر کەسەکە ماوەی ئەزموونەکەی تەواو کردوو لەوماوەیەدا دادگا هیچ بڕیارێك دەرنەکات سەبارەت بەهەڵوەشاندنەوەی ئازادکردنی مەرجدار، لەم حاڵەتەدا هەموو ئەو سزایانەی کەڕاگیراون هەڵدەوەشێنەوە(126).

**ئەم حاڵەتانە بڕیاری ئازادکردنی مەرجدار نایانگرێتەوە:**

**حاڵەتی یەکەم:**

- تاوانباری گەڕاوە بۆتاوان.
- دەرچونی بڕیار بەکاری قورس بەسەر دزێکدا یان بڕیاری بەندکردن بەسەر دزییەکی تریدا تەنانەت ئەگەر ماوەی سزاکەشی لەزینداندا تەواو کردبێت.
- دەرچوونی بڕیار بەسەر تاوانی دزینی سامانی گشتی، بەکاری قورس یان بەندکردن لەکاتێکدا ئەم تاوانبارە پێشتر هەمان سزای بۆ هەمان تاواندا بەسەردا درابێت تەنانەت ئەگەر تێکڕای ماوەی سزاکەشی لەزینداندا بەسەر بردبێت.

**حاڵەتی دووەم:**

- تاوانەکانی دژ بەئاسایشی دەرەکی دەوڵەت یان ساختەکردنی دراو (العملە) یان پوول وبەڵگەنامە داراییە حکومییەکان.

**حاڵەتی سێیەم:**

- تاوانی سێکسی بەرامبەر هەمان ڕەگەز یان ڕەگەزی مێ، لەڕێگای بەکارهێنانی هەڕەشەو ترساندنەوە یان بەبێ ڕەزامەندی لەگەڵ ئەوتەمەنانەی دەکەونە خوار هەژدە ساڵەوە، یان هاندان وڕێ خۆشکردن بۆ ئەم جۆرە تاوانانە(127).

## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی دووەم:

. الدورى، عدنان (1989): علم العقاب ومعاملة المذنبين، ط1 دار ذات السلاسل، الكويت، ص198.

. فوكو، ميشيل (1990): المراقبة والمعاقبة (ولادة السجن) ترجمة على مقلد ومطاع صفدي، مركز الانماء القومي، بيروت، ص144.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل 43.

. ابو عامر، محمد ذكي (1981): دراسة في علم الاجرام والعقاب، دار الجامعة، بيروت، ص183-188.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (4) ل204.

. السراج، عبود (1985): علم الاجرام وعلم العقاب، ط3، الكويت، ص403.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل48.

. ——(ب،ت): علاج المجرمين، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، اربيل، ص5.

. ابو عامر، محمد ذكي وثروت، جلال (1983): علم الاجرام والعقاب، دار الجامعة، بيروت، ص260- 261.

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (4) ل210

. هەمان سەرچاوەی ژمارەی (8)، ل5

. هەمان سەرچاوەی ژمارەی (9) ل263

- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (8) ل6
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (9) ل268
- هەمان سەرچاوە ل269
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (1) ل245-249
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (10) ل224- 226
- هەمان سەرچاوە ل188
- العاني، محمد شلال وطوالبة، علي حسن (1998) علم الاجرام والعقاب، ط1، دارالمسيرة، عمان، ص225.
- العبودي، جاسم (1990) :التجريم والعقاب في اطار الواقع الاجتماعي، دار الحكمة، جامعة صلاح الدين، اربيل، ص68.
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (6) ل403
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (20) ل68-69
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (9) ل286- 289
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (6) ل403-404
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (9) ل255
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (19) ل254-258
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (9) ل290-292
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (1) ل198
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (9) ل293-295
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (1) ل290- 291
- هەمان سەرچاوەی ژمارەی (19) ل278
- هەمان سەرچاوە ل289

- عقيدة، محمد ابو العلا، (1995): اصول علم العقاب، دار الفكر العربي، القاهرة، ص198
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (9) ل306-313
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل187-191
- طالب، حسن (1997): علم الاجرام- الجريمة، العقوبة والمؤسسات الاصلاحية، دار الفنون، بيروت ص176
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (36) ل177
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل388
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (36) ل178
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل444
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (36) ل170
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (8) ل7-8
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (36) ل178
- هەمان سەرچاوەی ژمارە 019) ل236
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل161
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل87
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل348
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (8) ل20
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل218-220
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (8) ل21
- هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل502
- عبدالله، محمد معروف (1990): علم العقاب، دار الحكمة، بغداد، ص25

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (36) ل179

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل332

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل26

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل333

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (2) ل240

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل217

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل290

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل331

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (8) ل20

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل445

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل447

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل332

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل353

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (9) ل340-344

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل345

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل355

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل346

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل90

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل361

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل91

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل322-324

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل73

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل459

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل460

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل324-328

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل95

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (9) ل236-240

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل463

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل364

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل78

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل464

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل370

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل79

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل366

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل374-377

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل383

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل469-471

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل406

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل144

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل125

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل410

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل477

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل126

. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل411-413

. ئـەم سیسـتمە لەوولاتەیـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا سـەری هـەڵدا بەهۆی ئەزمونێکەوە لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، لەسەرەتادا سیستمی

تاقیکردنــەوە لــەولاَتانی (ئــەنگلۆ سکۆســنیە، سیســتمی ئەنگلۆسەکســۆنی) بەرئـەنجامی ئـارەزووی دادگـای قـەزائی بـوو لەجیّبەجیّنـەکردنی سـزاکاندا بەســەر هــەندیّ گوناهبــاردا کــەبارو زروفەکــەیان ئــەوەی پیشــاندەدا کــە پیّویستیان بەو سزایە نیەو باشتر وایە لەدەرەوەی دامـەزراوە سـزاییەکاندا چارەسەر بکریّت، ئەم حەزەش هـەندیّ کەسـی خۆبـەخش یـاریدەدەر بـوون لەجیّبـەجیّ کردنیـدا، ئـەو کەسـە خۆبەخشـانە ئامــادەبوون سەرپەرشـتیو یارمەتی ئەوکەسانە بدەن کـەدادگا حـەزی دەکـرد ئازادیـان بکـات، یەکـەمین خۆبەخشیش (جۆن ئۆگەستس) ی وەستای دروستکردنی پیّلاَو بوو لەشـاری (بۆسـتن) کەلەسـالّی 1841حوکمدراویّکـی بـەتاوانی سەرخۆشـی لـەخۆگرت وچـاودیّری دەکـرد، پاشـان ئـەو حوکمـدارە بـوو بەهاوولاَتیـەکی چـاك وبـیّ کیّشـەو ئاسـایی، پـاش سـەرکەوتنی ئـەم ئەزموونـە، ئۆگســتس لــەماوەی حەڤدەسـالّدا 1152 کـوڕو 794 کچـی (تۆمـەتبارو گوناهبــاری) لــەخۆگرت وچـاودیّری کـردن ویارمـەتی مـادیو مەعنــەوی دان. لـیّرەوە ژمـارەی ئـەو خۆبەخشانە زیادیکردوو ناونران (ئەفسەری تاقیکردنەوە) بەر لـەوەی یاسـا سیستمی تاقیکردنەوە بەڕەسمی بناسیّت.

. هەمان شەرچاوەی ژمارە (33) ل413.
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل128
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل480
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (47) ل129
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل481
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل418
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل482
. هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل419

- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل482**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل483-484**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل422**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل488**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل442**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل348**
- .  **هەمان سەرچاوە ل348**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل490**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل446**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل492**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل344**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (33) ل434**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (1) ل421**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل493**
- .  **العطار، محمد سلمان، (1965): الاجرام والمؤسسات العقابيـة، ط2، دار التضامن، بغداد ص70**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل494**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (8) ل73**
- .  **هەمان سەرچاوە ل75**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (19) ل345**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (6) ل498**
- .  **هەمان سەرچاوەی ژمارە (8) ل75**
- .  **هەمان سەرچاوە ل74**

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا:



★ ساڵی 1966 لـە سـلێمانی لـەدایك بووە.

★ بەشی پەروەردەو ★ سایکۆلۆژیای لـەزانکۆی موسـڵ بەپلـەی یەکـــەم تەواو کردووە.

★ لـــەزانکۆی بـــەغدا ماســـتەری لەسایکۆلۆژیای (کەسێتیو درووستی دەروون) دا وەرگرتووە.

★ ئەم کتێبانەی بەچاپ گەیاندووە:

- ســـایکۆلۆژیای خـــەوتن وخەوبینین. 1997 (نووسین)
- خەواندنی موگناتیسی. 1997 (نووسین)
- خۆشەویستی لەنێوان دڵ ودەماغدا. 1998 (وەرگێڕان)
- دەربارەی هونەری سەرکردایەتی کردن. 2001 (وەرگێڕان)
- سۆسیۆلۆژیای خێزان. 2002 (وەرگێڕان)

- ئادەمیزاد لەنێوان ڕواڵەت وجەوهەردا. (وەرگێڕان) لەژێر چاپدایە.
- دەیان ووتارو لێکۆڵینـــەوەی سـایکۆلۆژیو پاراسـایکۆلۆژی لـەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بلاّو کردۆتەوە.
- ئێستا مامۆستای یاریدەدەرە لە بەشی کۆمەڵناسی/ کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکان لە زانکۆی سلێمانی.